# کوردستان

## لەلێکۆڵینەوەکانی ژاک دمۆرگاندا





نووسینی:
ژاک دمورگان

وەرگێران:
د. سعید خضری
(زانکۆی کوردستان)
ئاسۆ عبدالرحمن

# کوردستان
# لەلێکۆڵینەوەکانی دمۆرگاندا

نوسینی:

ژاك دمۆرگان

وەرگێڕانی:

دکتۆر سعید خضری

(مامۆستای زانکۆی کوردستان)

ئاسۆ عبدالرحمن

چاپی یەکەم

٢٠١٢

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە ٣٨٩



ناسنامەی کتێب

کوردستان لەلێکۆڵینەوەکانی دمۆرگاندا

نوسینی: ژاك دمۆرگان

وەرگێڕانی: دکتۆر سعید خچری ـــ ئاسۆ عبدالرحمن

بابەت: لێکۆڵینەوە

نەخشەسازی: ئاری محمد ساڵح

دیزایینی بەرگ: فواد کەولۆسی

نۆبەت و ساڵی چاپ: یەکەم، ٢٠١٢

شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج

تیراژ: ١٠٠٠

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارە سپاردنی: (١٧١٦)ی ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە.



ناونیشان

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# پێڕستی بابەتەکان

## پێرستی شێوەکان

**پێش وتەی وەرگێڕان**

ئێمە نیشتمانی خۆمان ناناسین و لە توانا و توانستەکانی بێئاگاین. ئـەم وتەیـە پێویست بە سەلماندن ناکات. هەر بەم هۆیەشەوە بازاڕی جوگرافی لای ئێمە وەهـا سارد و سڕە. دەبێت ڕاستیە پێویست و گرنگەکان لە بیر نەکەین کە ئەویش ئەمەیـە کە سەرەتا دەبێت بەرهەمە زانستیە جوگرافیەکان بۆ سەر زمانی خۆمان وەربگێڕین و دواتر بە پێکهێنانی ناوەندێکی زانستی ڕاستەقینەی جوگرافی قوتابیانی جوگرافیا تیایدا خەریک بە لێکۆڵینەوە و دیراسە جۆراوجۆرەکان بن. ئەمەش ئـەرکی گشـت ئەو کەسانەیە کە بە هەر شێوەیەک سەروکاریان لەگەڵ جوگرافیادا هەیە.

لێکۆڵینەوە جوگرافیـەکانی ژاک دمۆرگـان لـە گرنگتـرین و کـۆنترین بەڵـگە زانسـتیە جوگرافیـەکانی نیشـتمانی ئێـمەن. نووسـینەکانی دمۆرگـان دەکرێـت ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای قوتابیانی جوگرافی لای ئێـمە لـە بوارەکـانی جـوگرافی و زەویناسیەوە بێت.

نووسینەکانی ژاک دمۆرگان بۆ دوو دەستەی سەرەکی دابەش دەبن کـە بـریتین لە: یەکەم ئەو نووسینان کە زیاتر لە شێـوەی کۆکردنـەوەی بەڵـگە و دۆکۆمێـنت و نووسیەکانن و دووەم ئەوانەن کە ژاک دمۆرگان خـۆی لێکۆڵـینەوەی لـە سـەریان کردووە و ئەم نووسینانە بۆ سەردەمی ژیانی خۆی دەگەڕێنەو

ئەم کتێبە زیاتر لە سەر شێوازی دەستەی یەکەمە کە بەڕێز کازم وەدیعی ئەرکی وەرگێڕانی بو سەر زمانی فارسی کێشاوە و ئێمەش کردوومانە بە کوردی.

لە کاتی نەبوونی ئەم کتێبەدا دمۆرگـان وەک هـەر زانایـەکی‌تـر خـەریک بـە نزیک‌بوونەوە و بیرکردنەوە لە ئامانجە زانستیەکەی خۆی بووە. هەر زانایەک کە لـە دوورەوە بەرەو نیشتمانێک دێت و لەم شوێنەدا بەسەرهاتەکانی خۆی دەنووسێتەوە،

سروشتیە کە هەندێ جار کاریگەری ئەو ڕووداوانەی لە سەر دەبێت کە لە سەفەردا بە سەریدا هاتوون یا خود بینیویەتی و بەم شێوەیە نووسەر مۆرکی ڕاست بوون لە ڕووداوەکان دەدات، بۆیە ناکرێت کە بڵێین ئەم بەرهەمانەی دمۆرگان بەتاڵ لە کەم و کوڕین. بە تایبەت لە هێنانی ناوەکاندا هەڵە بەرچاو دەکەوێت. بەڵام کتێبی بەردەست کە لە نووسینە جوگرافیەکانی ژاک دمۆرگانە و بەرهەمی لێکۆڵینەوە و گەڕانەکانی وەفدی هاوڕێ لەگەڵ ژاک دمۆرگاندا بووە بە دڵنیاییەوە تەنیا و گرنگترین سەرچاوەی زانستی و کامڵ لە بارەی جوگرافیای ڕۆژئاوای ئێران و ڕۆژهەڵاتی کوردستانە، کە بە تایبەتی لە بواری جوگرافیای سروشتیەوە هەڵگری زانیاری زۆر گرنگ و پڕبایخە.

سپاس بۆ بەڕێزان سەید شەهاب خزری، ڕەشید زاهیری، عەزیز فەهیمی و عەباس جەلیلیان کە ئەرکی ڕاستکردنەوەی ناوە جوگرافییەکانی ناوچەکەیان وەئەستۆ گرت.

وەرگێران سعید خضری – ئاسۆ عبدالرحمن

بەهاری ٢٠١٢

## ژاک دمۆرگان کێیە؟

له بارەی ژاک دمۆرگانەوە لە سەرچاوەکاندا بەم شێوە ئاماژەیان پێ داوە و دەڵێن کە ناوبراو لە ١٣ی ژوەنی ١٨٥٧دا لە هۆیسۆنسۆرکوسۆنی هەڵکەوتوو لە فەڕەنسا لە دایک بووە و لە ساڵی ١٩٢٤دا کۆچی دوایی کردووە. ناوبراو لە بەشی کانزادا خوێندنی بە کۆتایی گەیاندووە و لە هەمان ساڵی بە کۆتایی گەیاندنی خوێندنیەوە ئەرک و سەفەرە زانستیەکانی دەست پێکردوون. یەکەمین سەفەرە زانستیەکانی ژاک دمۆرگان دوای خوێندنی بۆ ولاتانی بەریتانیا و بەلجیکا و ئەڵمانیا و نەمسا و ئەسکەندەناڤیا بوون کە لە ئاکامی ئەم سەفەرانەوە دوو کتێبی «زەویە کرتاسەکانی ئەسکەندەناڤیا» و «زەویناسی بوهێم» جێ ماون. ئەرک و سەفەرە زانستیەکانی تری ناوبراو کە لە دواتردا بە ئەنجامی گەیاندوون بەم شێوەیە بوون:

ساڵی ١٨٨٥-١٨٨٤ بۆ هێند و مالاکا سەفەری کرد.

ساڵی ١٨٨٦ لەگەڵ وەفدێکی زانستیدا بەرەو قەفقاز و چین بەڕێ کەوت.

ساڵی ١٨٨٩ بەرەو ئێران هات و تا ساڵی ١٨٩١ لەم ولاتەدا ماوەتەوە. لەم سەفەرەدا ٥ کتێب لە ٩ بەرگدا لە لایەن دمۆرگان نووسرا کە باسیان لە جوگرافیا و زەویناسی و مێژوو و زمانەکان دەکرد.

ساڵی ١٨٩١ بەرەو فەڕەنسا گەڕایەوە و لەوێوە بۆ میسر دەچێت و تا ساڵی ١٨٩٧ وەک سەرۆکی وەفدێکی زانستی لەم ولاتەدا دەمێنێتەوە کە لەم ماوەیەدا زانیاری و دۆزینەوەی گرنگیان لە بارەی میسرەوە بەدەست هێنا.

ساڵی ١٨٩٧ جارێکی تر وەک سەرۆکی وەفدێکی زانستی بەرەو ئێران هاتووە

و دوای بەستنی پەیماننامە لەگەڵ مزەفەرەدین شادا لە شووش نیشتەجێ دەبێت و خەریک بە لێکۆڵینەوە مێژووییەکان دەبێت. دمۆرگان باس لە کەلوپەلی دۆزراوە و بردنیان بۆ فەرەنسا دەکات. ژاک دمۆرگان لەم سەفەرەدا ١١ ساڵ واتا تا ساڵی ١٩٠٨ لە ئێران بووە و لەم ساڵەدا بەرەو فەرەنسا گەڕایەوە. ناوبراو لەم سەفەرەدا دۆزینەوە و بەڵگەی گرنگی لە بارەی ئیلامیەکانەوە بە دەست خست.

دمۆرگان لە ساڵی ١٩٠٩ەوە چەند نووسینێکی دەرکردن کە گرنگترینی ئەوان «یەکەمین شارستانیەتەکان» و «لە بارەی میللەتانەوە» بوون. جگە لە کتێبەکانی کە لە ماوەی ساڵانی ١٩١٧ تا ١٩٢١دا نووسیویەتی دمۆرگان نووسینیتری لە بارەی عوسمانی و ڕۆژهەڵاتەوە بوون کە پێدەچێت گرنگترین و دواهەمین نووسینی کتێبی «مرۆڤ بەر لە مێژوو» و لێکۆڵینەوەکانی ناوبراو لە بارەی سەرەتا و سەرهەڵدانی شارستانیەتەکانەوە بووە.

گشت ئەو کەسانەی کە لە نیو سەدەی ڕابردوودا ویستوویانە لە بارەی جوگرافیای ناوچەکەوە نووسینیان هەبێت و بە تایبەت ئەو کەسانە کە ویستوویانە نووسینەکانیان بە شێوەیەکی زانستی پێشکەش بکەن ئەوا بە شێوازی ڕاستەوخۆ یاخود ناڕاستەوخۆ قەرزداری ژاک دمۆرگانن. ئەم وتەیە بەم مانایە نیە کە ناوبراو زانایەکی جوگرافی بە مانا ڕاستیەکەی وشە بووە، بەڵام نووسینە جوگرافیەکانی ژاک دمۆرگان ئەمەش دەردەخەن کە ئەم زانایە زۆر زیاتر لەوە شارەزای جوگرافی بووە کە بۆ مێژووناس یا کانزاناس یا زمانناسێک پێویست بووە. نووسینە جوگرافیەکانی ژاک دمۆرگان وەک سەرچاوەی سەرەکی و زانستی پشتیان پێ دەبەسترێت بۆیە شوێنی ئەم زانایە لە ناو ئەم زانستەدا ئینکار ناکرێت.

## پێش وتەی نووسەر

ئەم بەرهەمانە کە من ئەمڕۆکە پێشکەش بە خوێنەرانی دەکەم دەکرا زۆر ڕێکوپێکتر و کاملتر و بە ڕێزمانێکی پاراوترەوە بوایەن. من لەم بارەوە کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو فەڕەنسا دەگەڕامەوە بیرم لەوە دەکردەوە کە کاتێک بە فەڕەنسا گەیشتمەوە بە دوور لە هەر کارێکی ترەوە خەریک بە ئامادەکردنی ئەم نووسینانە بم. بەڵام لە کاتی گەڕانەوەم لە ئێرانەوە و گەیشتنم بە فەڕەنسا لە لایەن بەڕێوەبەرایەتەکەمانەوە وەک ئەرکدار بەرەو میسر ڕاسپێردرام و دەبوایە دووبارە فەڕەنسا جێ بهێڵم. من کە جگە لە نووسینەکانی ڕۆژانەی خۆم و چەند کتێبێکی تر سەرچاوەیەکم نەبوو لە ناو کۆمەڵێک کێشە و گرفتدا مابوومەوە. من لەم سەفەرەدا ئەرکدار بووم و بەم شێوەیە کاتەکانی من بە سەر ئیشەکانی دایرەوە دابەش کران. کارە گرنگەکانی هەڵکەندن و شیکردنەوە و پۆلێنبەندی و... هتد کە زۆربەی کاتەکان دەبوایە خۆم بە سەر کارەکانەوە بم وای کردبوو تا تەنانەت لە کاتی بە چاپ گەیاندنی ئەم نووسینانەشدا لە پرۆسەی چاپ دوور و بێ‌ئاگا بم و کارەکە وەک پێویست بەرەو پێش نەچوو. بەڵام من چۆنیەتی ڕێزمانی ئەم بەرهەمانەم فیدا و قوربانی ئەرکی گرنگتر کرد. داوای لێبوردن لە خوێنەرانی خۆشەویست دەکەم بۆ کەموکوڕیەکان کە بەم هۆیەوە هاتتەدی.

مەبەستی من لە باس‌کردنەکانم لە بارەی ناوچەکەدا ئەو کێشە و گرفتانە نین کە لەم سەفەرەدا بۆمان هاتوونەتە پێش. من تا جێگەیەک کە توانیبێتم هەوڵم داوە تا

باس له گرفتەکانی تایبەتیمان نەکەم و زیاتر تیشک بۆ سەر بابەت و دۆزینەوە زانستیەکان بخەم که لەم سەفەرەدا پێیان گەیشتووین که له سەر بانگهێشتی جەنابی وەزیری مەعارف له سپتامبەری ۱۸۸۹دا هاوڕێ لەگەڵ وەفدێکدا هەوڵمان بۆیان داوە.

من تا جێگەیەک که بتوانم له دەربڕینی ڕای تایبەتی خۆم، خۆ دەپارێزم و هەوڵ دەدەم تا بابەتەکان وەک خۆیان بخەمە ڕوو، بەڵام بۆ ئەمە که خوێنەر دڵنیا بێت که من بابەتە نووسراوەکانم ڕاستەقینەن و من به شوێنە ناوبراوەکاندا تێپەڕ بووم له سەر زۆر شوێن چەندین تێبینیم نووسیون تا هەروەها بەم کارەم خزمەتێکم بەو کەسانەش کردبێت که دوای من بەرەو ئەم ناوچەیە سەفەر دەکەن.

من بەر له هەر شتێک هیوادارم بابەتەکان لە نووسینەکانمدا ڕوون بن و بە ئاسانی بەردەست بکەون و خوێنەر بۆ دۆزینەوەی بابەتێک ناچار بە ئەوە نەبێت که زۆر بابەتی خۆش یا ناخۆشی من که مەبەستی خوێنەر نین بیانخوێنێتەوە. من لە ڕووی ئەزموونی خوێندنەوەی خۆمەوە دەزانم کە دۆزینەوەی بابەتێک لە ڕۆژنامەیەکی تێکەڵاودا بۆ خوێنەر چەندە ئەستەمە، بۆیە هیوادارم نووسینی من لەم چەشنە نەبێت و خوێنەر بە خوێندنەوەی نووسینەکانم شادمان بێت نە وەک بێتاقەت.....

نووسینەکانی گشتی من له سەر ئێران و ئەم ناوچەیە بۆ چوار بەش دابەش دەکرێن که بریتین لە: لێکۆڵینەوە جوگرافیەکان، لێکۆڵینەوەکانی زمانناسی و ڕەگەزناسی، لێکۆڵینەوەکانی مێژوونەسی و لێکۆڵینەوەکانی زەویناسی.دەبینین کە گشت نووسینەکانی من شێوازی لێکۆڵینەوەیان هەیە و من به هیچ شێوەیەک باس لەوە ناکەم که لێکۆڵینەوەیەکی بێعەیب و کەموکوڕیم پێشکەش کردووە. هەوڵی

من لەم سەفەرەدا دۆزینەوە و دەرخستنی ڕاستی و زانیاری و بەڵگەی نوێن و ئەمە دەبێت لە بەرچاو بگرین کە من لـە نووسینەکانمدا خوێنـەر لـە بەرامبـەر خەمـدا ڕادەگرم و قسەکانم لەگەڵ خوێنەرن. لەم باسانەدا بە پێی ئەزموونی کاری خۆم من باس لەم بارودۆخە دەکەم کە لە سەفەری مندا بۆ ئەم ناوچەیە دەبوایـە لـە بـەرچاو بگیرێن. هەروەها ئەم زانیاریانە کە مـن خسـتوومنە ڕوو دەشێـت زۆر کـەس کـە سەردانی ئێران دەکەن کەڵکیان لێوەربگرن. من هەروەها باس لەم ئاراسـتانە دەکـەم کە من و وەفدەکەم پیایدا تێپەڕ بووین و ئەو هۆکارانە دەخەمە ڕوو کە وای کرد من و وەفدەکەم لە شێوازی گەشتوگوزار بە چەند ناوچەیەکدا تێـپەڕ بـین. مـن هـەوڵ دەدەم کەمتر باس لە کێشە و گرفتە تایبەتی و بچووکەکان بکەم.

لە سەردانی ئاسیای کۆن و ناوەڕاستدا بابەتێکی جێی سەرنج و گرنگ هاتوچۆ و گواستنەوەی مرۆڤ و شتومەکەکانە کە سەردانکەر بۆ ئەم مەبەستە دەبێـت یـەک لەم دوو ڕێگەیانە هەڵبژێرێت: کڕین یا خود بەکرێگرتنی بارکێش (وڵاغ).

بەکرێگرتنی بارکێش تەنیا لە حاڵەتێکدا مومکینە کە سـەردانەکە کـورتمـاوە بێت و سەردانکەر ناچار نەبێت زوو بە زوو بووەستێت. لەم حاڵـەتەدا سـەردانکەر دەتوانێت خەرجی کڕینی بارکێش بە ئەستۆ نەگرێت و بەکرێگرتنی بارکێش باشترە.

... بەڵام گەر سەفەر دوور و درێژ بێت ئەوا کڕینی بارکێش زۆر باشـترە. واتـا گەر لـە مانگـەکانی سـەرەتادا خـەرج و تێـچوونەکانیش زیـاتر بـن ئـەوا نابێـت سەردانکەر لە دڵی گران بێت. چونکە هێشتا ئەم ڕێگەیە کەمتری تێدەچێـت و لـەم ناوچانەدا بەکرێدەری بارکێش و چاوساغان و شارەزا ناوچەییەکان لەم توانایەی کە هەیانە کەڵکی خراپ وەردەگرن.

کەسێک کە بۆ ڕۆژهەڵات سەفەر بکات و زمـانی ناوچەکـە نەزانێـت بـوونی

وەرگێڕێک لەگەڵیدا زۆر پێویستە. بەڵام دۆزینـەوەی وەرگێـڕ و شـارەزایەک زۆر گرنگە. هەروەها لەگەڵدا بوونی کەسێک بۆ دروستکردنی خواردەمـەنی پێویـستە. ئەم کەسە دەبێت لەگەڵ شتومەکدا لە سەر بارکێشێک سوار بـێ و هـاوڕێ لەگـەڵ کاروانەکەدا بڕوات. دۆزینەوەی کەسێکی باش بۆ دروسـتکردنـی خواردەمـەنیش زۆر گرنگە.

کوردەکان بە ڕواڵەت لە جووتیارانی ئێرانی ترسنۆکترن، بەڵام زۆر لەوان باشتر پێشوازی لە میوان دەکەن. ئەمەش دەبێت بڵێین کە لەم وڵاتـەدا کـە دوو مەزهـەب (ئایینزا)ی سەرەکی سوننە و شیعە بوونیان هەیە، ئەورووپییەک کـە دەچێـت دەبێـت بەردەوام پرس و ڕا لەگەڵ سوننەدا بکات.

کوردەکان لە ئێـران ژمارەیـان کـەمتر لـە کـوردانی نـاو سـنووری دەوڵـەتی عوسمانییە. کوردانی ناو سنووری ئێران لە بەرزاییەکانی ئاراراتـەوە تـا موکریـان و گەڕووس و سنە و کرماشان و ڕووباری سەیمەرە و پشتکێو لە بەر دەگرن.

کوردەکان چ لە ئێران و چ لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا بە سەر چەنـدین خێڵـی گەورەدا دابەش بوون... گەورەکانی ئەم خێڵانە بۆ دروسـتکردنـی بەرەیـەک و لـە یەکتر نزیک بوونەوە هەوڵیان نەداوە و زیاتر پشت بە دەسەڵاتداران دەبەستن یا بـە شێوەیەکی سەربەخۆ لە کوێستانەکاندا ژیان بە سەر دەبەن. کوردەکان ژمارەیان زۆرە و گشت ئەمانە چەکدار و سەربازانێکی بوێرن...

پێشتر کوردەکان بە گشتی خێوەتنشین بوون، بـەڵام لـەم دواییانـەدا گونـدی زۆریان بنیاد ناون و لە موکریان و گـەڕووس و سـنەدا ئەمڕۆکـە ژمارەیـەکی زۆر گوندیان دروست کردوون. بەڵام هێشتا دانیشـتوانی ناوچـە سـنووریەکان لـە ژێـر خێوەتە ڕەشەکاندا ژیان بە سەر دەبەن. دەسەڵاتدارانی ئێرانی بەردەوام ناچار بـوون

تا به تونـدوتیژی كوردەكـان كۆنتـرۆڵ بكـەن. زۆر جـار خێڵـی كـوردی بـەرەو ناوچەكانی‌تر دوور خراونەتەوە. بۆیە ئەمڕۆكەش له زۆر شوێن وەك مازەنـدەران و قەزوین و... هتد كوردەكان بەرچاو دەكەون. ئەوان هێشتا به زمانی دایكـی خۆیـان دەدوێن.

مینیه- ژاك دمۆرگان

٢٤ی دیسامبری١٨٩٣

## بەشی یەکەم: کوردستانی موکری (موکریان)[1]

١- شوێنی پیادا تێپەڕبوونی وەفدی زانستی فەڕەنسا بە موکریاندا:
- ٩ی سێپتامبری ١٩٨٠،میاندواو.
-١٠ی سێپتامبری ١٩٨٠، نەگریقاش.
- ١٣ تا ٢٣ی سێپتامبری ١٩٨٠، سابڵاغ.
- ٢٤ی سێپتامبری ١٩٨٠، خالدەلیل.
- ٢٥ و ٢٦ی سێپتامبری ١٩٨٠، گلگە.
-٢٧ تا ٣٠ی سێپتامبری ١٩٨٠، سەردارئاوا.
- ١ تا ٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، عیسا کەند.
- ٤ و ٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، سابڵاغ.
- ٦ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، پەسوێ.
- ٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، هێ.
- ٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، کێلەشین.
- ٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، نەڵۆس.
- ١٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، پەسوێ.
- ١١ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، بەرکەمران.
- ١٢ و ١٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، بادیناوێ.
- ١٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، بەستام بەگ.
- ١٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، گۆمان.
- ١٦ تا ٢٠ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، سەردەشت.
- ٢١ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، نەمەشیر.
- ٢٢ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، بانە.
- ٢٣ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، میرەدێ.
- ٢٤ تا ٢٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، سەقز.
- ٣٠ و ٣١ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٠، بۆکان.
- ١ی نۆڤەمبەری ١٩٨٠، سەردارئاوا.
- ٢ی نۆڤەمبەری ١٩٨٠ میاندواو.

من لە ٢ی نۆڤەمبەردا بەرەو تەوریز وەفدی هاوڕێم جێ هێشت تا چەند نامەیەک کە بـۆ چـوونم بەرەو سنە دەمتوانی کەڵکیان لێ وەربگرم بە دەستیان بخەم و لە ١٧ی هەمان مانگـدا بـەرەو لای هاوڕێکانم گەڕامەوە. دەتوانن بۆ بەدەست خستنی زانیاری زیاتر لە سەر کوردستانی ئێران بڕواننە سەرچاوەکانی خوارەوە:
- سێر کینیر، «سەفەر بۆ کوردستان»، ١٨١٣.

## جوگرافياى سروشتى

بەرزاييەكانى موكرى له باشوورى دەرياچەى ورمێ و له رۆژئاواى بانى بەرزى ئێراندا هەڵكەوتوون. بەشێک له ئاوەكانى ئەم بەرزاييانه بۆ دەرياچەى ورمێ و بەشێكى‌تر بۆ ناو رووبارى ديجله ئاراسته وەردەگرن. واتا دەكرێت بڵێين كه لێرەدا سنوورى سياسى لەگەڵ هێڵەكانى دابەشكردنى ئاودا هاوئاهەنگ نين. لەم

---

- ج. س. بوكينگهام، «سەفەر له ئاسوور و... هتد»، ١٨١٦، بەشى٦ تا ٩.
- س. ج. ريچ، «باسى مانەوەم له كوردستان»، ١٨٢٠، بەرگى يەک بەشى٢ تا ٦.
- هۆن ج. كيبيل، «ئێران و باسى سەفەر و... هتد»، ١٨٢٤، بەشى١٢ تا ١٤.
- سێر ە. ويلۆک، «كوشتنى پرۆفيسۆر شولتز»، ١٨٢٩، رۆژنامەى R.A.S بەرگى١.
- جى. فاولێر، «سێ ساڵ مانەوەم له ئێران»، ١٨٣١ - ١٨٣٦، بەرگى يەک لاپەرەى ١٣٤ ، بەرگى٢ بەشى٢
- كاپيتان ر. ميگنان، «سەفەرى زستانه له رووسيا تا كوردستان»، ٢ بەرگ.
- سێر. ج. شيڵ، «رۆژنامەى ئار. جى. ئێس»، ١٨٣٦، لاپەرەى ٥٤.
- ج. ب. فريسێر، «سەفەر بۆ كوردستان و... هتد»، ١٨٣٤، بەرگى ١، نامەكانى ٣،٤ و٥، بەرگى ٢ نامەكانى٨،٩ و ١٠.
- سێر. هـ راولينسون، «رۆژنامەى ئار. جى. ئێس»، ١٨٣٦، بەرگى ١ لاپەرەى ١.
- ج. برانت، «رۆژنامەى ئار. جى. ئێس»، ١٨٣٨، بەرگى١٠ لاپەرەى ٣٤١.
- ج. ف. جۆنس، «باسى سەفەر له بەشێكى كوردستاندا»، ١٨٤٤، ژمارە ٣٤ بامبى ريكوردز ١٨٥٧.
- م. واگنێر، «باسى سەفەر له كوردستان».
- شەرەفخانى بەدليسى، «شەرەفنامە، مێژووى كوردستان»، ١٨٦٠-١٨٦٢، دو بەرگ.
- د. دەبليو. مارش، «ئێنسيەكان له كوردستانى ئێران»، ١٨٦٤.
- ف. ميلينگێن، «ژيانى ساكار له ناو كوردەكاندا».
- س. ج. مى. كوان، «ژێر پارێزگاريى نوێى ئێمە،ا توركياى ئاسيا»، ١٨٧٩.
- كلێنێل ر. ئى. كار، «زنجيره چياكانى كوردستان»، ١٨٧٩، له رۆژنامەى ر. يو. س. ئاى. بەرگى ٢٢ لاپەرەى ١٣٥ تا ١٨٤.
- ج. كريگ، «تورک، كورد و ئەرمەنيەكان»، ١٨٨٠، ٢ بەرگ.
- هـ بيندێر، «له كوردستاندا»، ١٨٨٦، بەشى ٥.
- بيشوپ، «سەفەر له ئێران و كوردستاندا»، ١٨٩٠، ٢ بەرگ.

بەشەدا سنووری سیاسی لە بەرزترین لووتکەکان پێک دێت.

هێڵی دابەش‌کردنی ئاو لە نزیک کێلەشین لە سنووری سیاسی دوور دەکەوێتەوە و بەرەو ڕۆژهەڵات دەکشێت و دواتر لە نزیک بەرزاییەکانی چلچەمە (چل‌چەشمە) و لە نزیک سەرچاوەکانی جەغەتوو و قزڵوەزان جارێکی تر بە سنووری سیاسی دەگاتەوە.

کوردستانی موکریان بە شێوەیەکی سروشتی بۆ دوو داوێنی دیاریکراو و لە یەکتر جیاواز دابەش دەبێت کە داوێنی یەکەم واتا داوێنی باکووری ڕۆژهەڵات ڕووبارەکانی وەک جەغەتوو و تەتەهوو و داوێنی دووەم واتا داوێنی باشووری ڕۆژئاوا حەوزی ڕووباری زێی بچووک یا هەمان ڕووباری کەڵوێ لە خۆ دەگرێت. ئاوەکانی موکریان جگە لە بەشەکانی باکوور و باشوور لە ناوچەکە بەرەو دەرەوە ناچن و ئەمە لە حاڵێکدایە کە لە ناو کوێستانەکانی موکریاندا ژمارەیەکی زۆری لق‌وپۆی ڕووبارەکان بە یەکتر دەگەن و بڕێکی زۆری ئاو بەم شێوەیە لە ناو ڕووبارێکی مەزنتردا کۆ دەبێتەوە.

موکریان لە ڕۆژهەڵات بە ڕووباری جەغەتوو کە بە ڕووباری خورخورەش ناوی لێدەبرێت و لە بەرزاییەکانی چلچەمە سەرچاوە دەگرێت کۆتایی دێت. بەشێکی زۆری ئاوی ئەم ڕووبارە لە لای چەپی ڕووباری سەقزەوە دابین دەبێت کە لە بەرزاییەکانی بەردەسوورەوە سەرچاوە دەگرێت و گشت ناوچەی سەقز بەراو دەکات. پێشتر سەقز لە ڕووی سیاسیشەوە بەشێک لە موکری بووە، بەڵام چەند ساڵێکە کە بە کوردستانی سنەوە لکاوە.

ڕووباری جەغەتوو تا گەیشتنی بە دەریاچەی ورمێ لە لای چەپەوە لقی گرنگ و پڕ ئاوی پێ ناگات. بەڵام بە پێچەوانەوە لە لای ڕاستەوە ڕووبارەکانی

وەک سارۆ و کورە و چەند ڕووبارێکی بچووکتری پێی دەگەن. بەڵام ئەم ڕووبارانە ئیتر بەشێک لە موکری نین و بە بەشێک لە سائینقەڵا یا هەمان شاهیندژی ئەمڕۆ دەناسرێن.

تەتەهوو دوای ڕووباری جەغەتوو بە گرنگترین ڕووباری دەناسرێت کـە لـە بەشی ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو دەریاچەی ورمێ دەڕژێت و لە موکریانیشەوە سـەرچاوە دەگرێت. ئەم ڕووبارە لە دۆڵێکی قووڵـەوە سـەرچاوە ئەگرێـت کـە بەرزاییـەکانی بەردەسوور و کورتەک لە یەکتر جیا دەکاتەوە. لقەکانی وەک ڕووباری خالۆ لە لای ڕاستەوە و ژمارەیەک لقـی سـەرچاوەی نـاوە سـاردەکان لـە لای چەپـەوە پێـش گەیشتنیان بە دەریاچەی ورمێ بەم ڕووبارە دەگەن.



شێوەی١- دۆڵی ڕووباری گادەر و بەرزاییەکانی دەوروپشتی.

داوێنەکانی باشووری ڕۆژئاوای موکریان بەرزاییەکانی دۆڵی ڕووبـاری زێـی بچووک و لقەکانیدا دەگرێتەوە.

ڕووباری زێی بچووک ناسراو بە چۆمی کەڵـوێ لـە بەرزاییـەکانی مەیدانـەوە

سەرچاوە دەگرێت کە بەرزاییەکەیان بە ٢١٤٠ مەتری ئاستی ڕووی دەریا دەگـات. ئەم ڕووبارە لە سەرەتادا بە ڕووباری لکبن ناو دەبرێت و لـە ڕۆژهەڵاتـەوە بـەرەو ڕۆژئاوا ڕێ دەکات. دواتر ئاراستەکەی بەرەو باشوور دەگۆڕێت تا نزیک ناوچـەی سەردەشت (ئاڵماناوێ بە بەرزی ١٠٠٠ مەتری لە ئاستی ڕووی دەریـاوە) دێـت و لەم ڕێرەوەوە ١٠٠ کیلۆمەتریەدا بەرزیەکەی ٥٦٠ مەتر دادەبەزێت. ئەم ڕووبارە بـە تێپەڕ بوون لە ناوچەی سەردەشت بە ئالان دەگات کە دەبێت لەم بەشەدا ڕووبـاری زێی بچووک ژمارەیەکی زۆر لە بەرزایی و چیا بڵندەکان ببڕێـت و دواتـر کـە بـە کوردستانی عێراق دەگات تا باشووری شاری هەولێر دەچێت و لـە کۆتاییـدا وەک لقێکی گرنگ دەرژێتە ناو ڕووباری دیجلە.

لقەکانی لای چەپی ڕووباری زێی بچووک بریتین لە: ڕووبارەکانی پەسـوێ و لاوێن و چۆمان و ژمارەیەک لقیتر کـە گشـت ئـەم ڕووبارانـە لـە بەرزاییـەکانی سنووری عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆوە) سەرچاوە دەگرن.

لە لای ڕاستەوە ڕووباری زێی بچووک ژمارەیەک لقی بچووک وەردەگرێت کە گرنگی ئەوتۆیان نییە تا لە ناوچەی ئالان کە ڕووبـاری بانـە بـە ڕووبـاری زێـی بچووک دەگات. زۆربەی ئەم لق و ڕووبارانە لە بەرزاییەکانی ناوچەی کوردسـتانی سنەوە سەرچاوە دەگرن.

لە نێوانی کێلەشین و ئالاندا ئەو زنجیرە چیایە کە دەرکـەوتووە ڕێکوپێـکیەکی زۆری هەیە و وەک هێڵێـکی ڕاسـت لـە بـاکووری ڕۆژئـاواوە بـەرەو باشـووری ڕۆژهەڵات دەکشێت. هەر وەک ڕوونە ئەمە دوا دیاردەی دەرکەوتووی چەمانـەوەی هاوتەریبی بەرزاییەکانی باشووری ئێران لە ناوچـەی موکریاندایـە. ئـەم زنجیرەیـە وەک جیاکەرەوەی سیستەمی بوڕکانی ناڕێکوپێکی ئاراڕات و ئەرمەنسـتان لەگـەڵ

ناوچەی نیشتەنی زەهاو و لوڕستان ناسراوە.

له ڕۆژئاوای ئەم بەرزاییانە داوێنەکان زۆر لێژترن و به شێوەیەک کـه دەبینـین ناوچەی هەولێر تا بەرزایی ٤٣٠ مەتری له ئاستی ڕووی دەریاوە دادەبەزێت، بەڵام له ڕۆژهەڵاتی ئەم بەرزاییانە زۆربەی ناوچەکان بەرزتر لـه ١٠٠٠ مـەتری ئاسـتی ڕووی دەریان و زۆرێک له لووتکەکان به ٣٢٠٠ مـەتر بـەرزتر لـه ئاسـتی ڕووی دەریا دەگەن. من بۆ هیچ کام لەم بەرزاییانە نەچووم، بەڵام به بەراوردکردنیان لەگەڵ کێلەشین دا که بەرزیەکەی به ٢٨٦٠ مەتر دەگات توانیومە ئەم بەرزاییانە بخەملێنم.

له نێوان شنۆ و ئالاندا زۆربەی لووتکەکان بەرزتر له ٣٠٠٠ مـەتر لـه ئاسـتی ڕووی دەریاوەن که بریتین له:

چیاکانی چیارەش، سپیریز، بـورزەک، کـانی‌خـولای، ئـالاوە، حـاجی‌بـرایم، قەندیل، ساوان، وەزنێ، بازار، زەردەلان و کونـەماڵ. زۆرێـک لـەم بەرزاییانـه بـه درێژایی ساڵ به بەفر داپۆشراون.

من پێش باسکردن له چیاکانی ناوەوەی موکریان باس لەم زنجیرە چیایە دەکەم که له لای ڕۆژهەڵاتەوە دەوری ڕووباری زێی بچووکی گرتووە. ئەم زنجیرەیـه بـه تەواوی لەگـەڵ زنجیـرە چیـای سـنووریدا کـه لـه بەشـی ڕۆژئـاوا هەڵـکەوتووە هاوتەریبە، بەڵام بەرزاییەکەی کەمتر له زنجیرەی ڕۆژئاوایە.

له بەشی باکوور ئەم زنجیرەیە وەک هێڵێکی ڕاست بەرەو ڕۆژهەڵات دەکشێت و بەم ئاراستەیە به ناوچەی سەردەشت دەگات. ئەمە له حاڵێـکدایە کـه زنجیـرەی سەرەکیش به هەمان شێوە بەرەو ڕۆژهەڵات ئاراستەی وەرگرتووە. له نێوان ئالان و چل‌چەمەدا ئەم زنجیرانە بەرەو ئەملا و ئەولا ئاراستە ناگۆڕن. ئەم دوو زنجیرانە لـه ڕووی زەویناسیەوە یەک پێکهاتەی هاوشێوەی یەکتریان هەیە کـه لـه لووتکەکانـدا

پێکهاتەیەکی کەڤری پتەو و له داوێنەکاندا چینەکانی نیشتەنی بەرچاو دەکەون کە پێکهاتەکانیان لاوازترە. ئەم دۆخە له ڕۆژهەڵاتەوە بۆ کەناری ڕاستی ڕووباری زێی بچووک و له ڕۆژئاواوە بۆ کەناری چەپی ڕووباری ناوبراو دەڕوانێت.

کەواتە دەکرێت بڵێین کە دۆڵی ڕووباری زێی بچووک لە ئەنجامی چەمانەوەیەکی نیشتەنیەکانەوە پێکهاتووە و لەم دۆخەدا هەر دوو کەناری ڕووبارەکە و داوێنەکانی کە بۆ سەر ئەم ڕووبارە دەڕوانن بە تەواوی لە یەکتر دەچن. بنکەی دۆڵی ڕووباری زێی بچووک خۆی بۆ دوو بەشی سروشتی لە یەکتر جیاواز دابەش بووە؛ یەکەم ئەو بەشە کە بەرزترە و ڕووبار لە سەر نیشتەنیەکانی خۆی ڕێ دەکات واتا ئەو نیشتەنیانە کە ڕووبار لە خۆی جێی هێشتووە تا ڕادەیەک ئاستی بنکی ڕووباری بەرزتر کردۆتەوە و دووەم ئەو بەشە کە ڕووبار لە سەر پێکهاتەیەکی پتەوی وەک بەردەکان هەڵکەوتووە. لە هەر دوو لای داوێنەکانی ڕووبارەکەدا ئاوە لە بەر ڕۆیشتووەکان بە یەک شێوە کاریان کردووە و نیشتەنیەکانی ناو بنک و ڕێڕەوی ڕووباری زێی بچووک لە ئاکامی دارمان و داماڵینی ئەم ئاوانە و گەیشتنیان بە ڕووباری زێی بچووک هاتۆتە دی.

هەر چەندە کە لە ڕووی تایبەتمەندی پێکهاتەوە دوو زنجیرەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات لە یەکتر دەچن، بەڵام لە ڕووی جوگرافیەوە لە یەکتر جیاوازن. زنجیرەی ڕۆژئاوا توندتر و لووتکەکانی بەرزتر و لێژایی تیایدا زیاترە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە زنجیرەی ڕۆژهەڵات جگە لە داوێنی ڕۆژئاوای ساحێبی وەها دۆخێک نییە. داوێنەکانی ڕۆژهەڵاتی زنجیرەی ڕۆژهەڵات بە ئارامی دەکشێن و تا کەناری لای چەپی ڕووباری جەغەتوو بڕانەوەیان نییە.

گرنگترین چیاکانی ئەم زنجیرەیە بریتین لە:

چیاکانی پاکوباوا و برایمەڕەشان و شوان بریان و پانەسەر و کورتەک و بەردەسوور، ئەم چیایانە لەم بەشە لە زنجیرە چیاکەدا هەڵکەوتوون کە ئاراستەی بەرەو ڕۆژهەڵات وەرگرتووە.

هەروەها چیاکانی ئۆمەرەشاڵ و کەلی خان لەم بەشە لە زنجیرە چیاکەدا هەڵکەوتوون کە ئاراستەی بەرەو ڕۆژئاوا وەرگرتووە.

لە نزیک ئەم دوو کوێستانەدا بەرزاییەک کە بە کێلەشین ناسراوە بەرچاو دەکەوێت و بەرزاییەکەی بە ٢١٨٠ مەتر دەگات.



شێوەی٢-بەرزاییەکانی برایمە ڕەشان

چیای بەردەسوور گەرچی بەشێک لەم زنجیرەیە، بەڵام زیاتر بەرەو ناوەوە هاتووە و چەند زنجیرەیەکی بچووکتر لێی بوونەتەوە کە تا کەناری ڕووباری جەغەتوو کشاون. بە هەمان شێوە کە هەر دوو زنجیرە چیا سەرەکیەکە ئاراستەی باکووری ڕۆژئاوا بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتیان هەیە زنجیرە چیا لاوەکیەکانیش هاوتەریبن. ئەم زنجیرانە بە لاریەکی کەم لە ڕۆژئاوا بەرەو ڕۆژهەڵات کشاون و بریتین لە:

تەکلتۆ، کە ڕووباری جەغەتوو لە ڕووباری سەقز جیا دەکاتەوە.

باباسەبەتڵوو، هەڵکەوتوو لە نێوان سەقز و گۆمەگەورە.

وەنەوشە، هەڵکەوتوو لە نێوان ڕووبار (چۆم)ی خالۆ و یەکێک لە لقەکانی کەناری ڕاستی ئەم ڕووبارە.

پارشێن، هەڵکەوتوو لە نێوان ڕووبار (چۆم)ەکانی خالۆ و تەتەهوو.

شەرمتان، هەڵکەوتوو لە باکووری تەتەهوو.

بە نزیکتر بوونەوە لە دەریاچەی ورمێ ئەوا بەرزاییەکان هێواش هێواش بەرزیەکەیان کەمتر دەبێتەوە. هەروەها ئاراستەکانیشیان ڕێکوپێکی خۆیان لە دەست دەدەن.

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەمەیە کە ئاراستەی ئەم زنجیرە لاوەکیانە لە سەر زنجیرە سەرەکیەکان ستوونیە، کەواتە ئەم ئاراستە هاوتەریب لەگەڵ ئاراستەی زنجیرەکانی ئۆمەرەشاڵ و خالیخان دایە. و هەر وەک ڕوونە دوای گۆڕینی ئاراستەی ئەم زنجیرەیە بەرەو ڕۆژهەڵات جگە لە چیای کورتەک نییە.



شێوەی٣- سیمای گوندی سەردارئاوا

لەم باسە دەکرێت ئەم ئەنجامانە بخەینە ڕوو کە چیاکانی موکریان بۆ دوو

دەستەی سەرەكی دابەش بكەین: یەكەم زنجیرە چیا سەرەكیەكان كە ئاراستەی لە باكوور و باكووری ڕۆژهەڵات بۆ باشوور و باشووری ڕۆژهەڵاتیان وەرگرتووە و دووەم زنجیرە چیا لاوەكیەكان كە ئاراستەی ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژئاوایان هەیە.

زەویناسی موكریان زۆر لەمە ئاڵۆزترە كە مـن بتـوانم لـەم باسـانەدا ڕوونیـان بكەمەوە. چالاكیە بوركانیەكان ڕێكوپێكی چینە نیشتەنیەكانیان تێك داوە كە لە زۆر شوێندا ئەم چینە نیشتەنیانە بە هـۆی دارمانیشـەوە جارێـكی تـر هەڵـكەندراون و شێواون. من تەنیا ناوی پێكهاتەكانی شانەدرشتی گرانیتـی خاڵـدەلیل و مەرمـەڕی سپی سەردەشت و كلسی تەرەغە و عیساكەند دەهێنم. لە دیاردە سروشـتیە سـەرنج ڕاكێشەكانی ناوچەكە دەكرێت بۆ ئەشكەوتەكانی كونەكۆتر و كونەماڵان لـە نزیـك گوندی عیساكەند و شاخی تەرەغە هەڵكەوتوو لـە چەنـد كیلۆمـەتری باشـووری ڕۆژئاوای سەردارئاوا ئاماژە بكرێت.



شێوەی ٤–زنجیرە چیای تەرەغە لە ڕووی حوسێن‌ئاواوە

شوێنی چوونە ناوەوەی هەر دوو ئەشكەوتی ناوبراو لە داوێنی چیای یەكاسەر لە نزیك گوندی عیساكەندە. كونەكۆتر شوێنی ژیانی ژمارەیەكی زۆر لە باڵـندەكانە و هەر لەم ڕوانگەوەیە كە بە كونەكۆتر ناسراوە. سەرەتای شوێنی چوونـە نـاوەوەی

ئەم ئەشکەوتە (کونەکۆتر) بە دەریاچەیەک دەست پێدەکات کە چوونە ناوەوە سەخت دەکات. من بەر لە چوونم بە چەند سەندووقێکی بەتاڵ بەڵەم شێوەیەکم دروست کرد کە بتوانم بەرەو ناوەوەی ئەشکەوتەکە بچم. هەروەها من بە کەڵک وەرگرتن لە ئامێرێکی دیاریکەری ناراستەکان و پەتێک نەخشەی هۆڵەکانی ناو ئەشکەوتەکەم بە دەست هێنا. بەڵەمی من زۆر جێگەی متمانە نەبوو و من تەنیا بە رووناکی مۆمێک بەرەو پێشەوە دەچووم، بۆیە گەر مۆمی من بکوژابایەوە یاخود بەڵەمی من تووشی نوقم بوون هاتبایە ئەوا من بە مەلە کردن گەیشتنم بۆ دەرەوەی ئەشکەوت زۆر ئەستەم دەبوو. بۆیە توانایی قەبووڵ کردنی ئەم مەترسیەم نەبوو.



شێوەی٥- زنجیرە چیای تەرەغە لەرووی سەردارئاواو

ئەشکەوتی کونەمالان تەنیا لە چەند مەتری ئەشکەوتی کونەکۆتر هەڵکەوتووە و شوێنی چوونە ناوەوەی ئەم ئەشکەوتە بە کەڤرە دارووخاوەکان نادیار ماوەتەوە. کەوا بوو بۆ چوونە ژوورەوە دەبێت شوێنێکی وەک چاڵ کە چەند مەترێک بەرەو قووڵایی زەوی دەچێت تێپەڕ بکەیت. ئەم شوێنە بۆ چوونە ناوەوە تا رادەیەک تەنگە کە چوونە ژوورەوە پیایدا زەحمەتە. دوای چوونەوە ناوەوە سەردانکەر بە

هۆڵێک دەگات کە نیوەی ژوورەکە ئاوی تیادایە و شێوازی دەریاچەیەکی لە خۆ گرتووە. دوای تێپەڕ کردنی چەند داڵانێکی بچووک بە هۆڵێکیتری گەورە دەگەین کە ئەویشیان بە هەمان شێوە زیاتر لە نیوەی ژوورەکە بە ئاو لە شێوەی دەریاچەیەک داپۆشراوە.

دانیشوانی ناوچەکە پێیان وایە کە دەریاچەکەی ناو ئەشکەوتی کونەکۆتر لەگەڵ ئەم دەریاچانەدا پێوەندیان هەیە. منیش لەم بابەتەوە دڵنیام، بەڵام نەمتوانی ئەم بابەتە شی بکەمەوە. لە ماوەی ئەم هەموو شەڕ و تێکهەڵچوون و وێرانکاریانەی کە کوردستانی گرتۆتەوە دانیشتوانی ناوچەکە پەنایان بۆ ئەم ئەشکەوتانە هێناوە بۆیە زۆر پاشماوە و ئێسقان و خەڵوز و... هتد تیایاندا بەرچاو دەکەوێت. هەروەها لە چەندین شوێندا چەندین چینی ئەستوور لە پاشماوەی باڵندەکان بوونی هەیە. من چینەکانی زەویم لەم ژوورانەدا هەڵدایەوە، بەڵام تا گەیشتنم بە ئاو جگە لە پاشماوەی بوونی مرۆڤ لەم ئەشکەوتانەدا شتێکیترم نەدۆزیەوە. لە ئەوپەڕی باکووری ژوورە گەورەکەدا و لە بەشی سەروو ڕێچکەیەکی باریک کە دیارە بە دەستی مرۆڤ هەڵکەندراوە بەرچاو دەکەوێت و ڕوونە کە ئەمە بۆ گەیشتن بە ئاستی ڕووی زەوی هەڵکەندراوە بەڵام بە ناتەواوی ماوەتەوە.



شێوەی٧- ئەشکەوتی کونەکۆتر

دووری شاخی تەرەغە لە عیساکەندەوە تەنیا یەک ڕۆژ ڕێگایە. لە دوورەوە ئەم شاخە بەرچاو دەکەوێت کە بەرزییەکەی بە ٢٢٢٠ مەتر دەگات. لە شاخی ناوبراوەوە گشت بەرزاییەکانی دەورویشت دەبینرێن. هەروەها دەبێت بڵێین کە ئەم شاخە لە پێکهاتەیەکی زۆر پتەوی مەرمەڕی زەرد پێکهاتووە کە بە گەیشتن بەم بەرزاییە دیمەنێکی کەم وێنە لە موکریان و دۆڵی جەغەتو بەرچاو دەکەوێت.



شێوەی٨- تاشەبەردی چیای ئەرەغە

## ئاووهەوا، ڕووەکی سروشتی و سامانی ئاژەڵ

لەم ڕوانگەوە کە ناوەندی بەرزی موکریان لە ئاستی ڕووی دەریـاوە زیـاتر لـە ١٣٠٠ مەترە لە وەرزی هاویندا زۆر جار پلەکانی گەرمی بە ٤٠ پلەی سەدی و لـە وەرزی زستاندا پلەکانی گەرمی تا ٢٠ پلەی سەدی ژێر سفر دادەبـەزن. ئەمـە لـە حاڵێکدایە کە وەرزەکانی بەهار و پاییز ئاووهەوایەکی مـامناوەنـدیان هەیـە و زۆر جار ئەم دوو وەرزە دوور و درێژتر لە وەرزەکانی هاوین و زستانن.

لە وەرزی هاویندا کە ڕۆژانە پلەکانی گەرمی زۆر بەرەو سەروو دەچن، ئەوا لە شەودا هەوایەکی سارد حاکم دەبێت. هەروەها لە سەرەتای ئۆکتۆبرەوە شـەوانە لـەم

ناوچەیەدا سەهۆڵبەندانە و لە کۆتایی ئـەم مانگـەدا هێـواش هێـواش بـەفر بەشـی سەرووی لووتکەکان سپی دەکات. پانزدە ڕۆژ دوای ئەم حاڵـەتە بـەفر لـە ناوچـە نزمەکانیشدا دادەبارێت. بـەفری قـورس دادەبارێـت و پێـوەندی نێـوان گونـدەکان دەپچڕێت. ئەم بارودۆخە تا مانگی مارس درێژە دەکێشێت، بـەڵام لـەم مانگـە بـە دواوە سروشت جارێکی‌تر تووشی نوێبوونەوە و زیندووبوونەوە دەبێت و بەفرەکان تووشی توانەوە دەبن و بە هۆی توانەوەی ئـەم بەفرانـە ئیتـر جۆگاکـانی بچـووکی ئاویش مەجالی پیادا پەڕینەوە نادەن. لە کەمتر لە یەک مانگـدا سروشـت ڕەنـگ و ڕوویەکی تەواو نوێبووە و زیندوو بە خۆوە دەگرێـتەوە. دوای بارانـە بەهاریـەکان ئاسمانی کوردستان بە دەگمەن هەور بە خۆیەوە دەبینێت و ماوەی چـوار تـا پێـنج مانگ وشکی لە کوردستاندا حوکمڕان دەبێت. لەم کاتەدا ئاو کەمـە و ئـەم سـامانە زۆر بەنرختر دەبێت و لە زۆر گوند ناچارن تا ئاو لە شوێنە دووردەستەکانەوە بەرەو گوند بهێنن. بۆیە لەم کاتەدا سـەرچاوە ئـاوە بچووکـەکانیش وەک سـەرچاوەیەکی ئاڵتوونی سەرنجڕاکێش و خۆشەویست دەبن.

ناوی سـاوجبلاغ (سـابلاغ یـان مهابـادی ئەمـڕۆ) کـە شوێـنی حەوانـەوە و ئیسراحەتی حاکمی ناوچەکەیە، پێشاندەری گرنگی ئەم سەرچاوانەیە کە بە واتـای سەرچاوەی سارد و سازگار دێت، بە تایبەتی گەر ئەم سەرچاوە ئاویانە سارد و بۆ خواردنەوە گونجاو بن ئەوا زۆر بەنرختر و خۆشەویست‌ترن.

لە موکریاندا بەشێک کە ئاووهەوایەکی گونجاوتری هەبێت و پلەکانی گـەرمی تیایدا بەم ئاستە تووشی دابەزین نەبـەن دۆڵـی ڕووبـاری زێـی بچووکـە کـە بـە بەرزاییەکان دەور دراوە و بەم شێوە کەمتر شوێنێکی باگرەوە دەبێت و بـەرزایی لـە ئاستی ڕووی دەریاشەوە لە شوێنەکانی‌تر کەمترە. بەڵام ئـەم دۆخـە گونجـاوە هـی

قووڵایی دۆڵەکەیە کە باسمان لێوە کرد، بەڵام شاری سەردەشت کە لە داوێنی نزیک بەم دۆڵەدا هەڵکەوتووە و بەرزایی لە ئاستی ڕووی دەریاوە زیاترە ئەوا ساردە و لە زستاندا سەهەڵبەندانە.

لە ١٥ی دێسامبرەوە ساڵانە پێوەندیەکان لە چیای کورتەک دەپچڕێن و بەم شێوەیە بانە و سەردەشت پێوەندیەکیان بە دنیای دەرەوەوە نامێنێت. ئەم دۆخە گرانە بە درێژایی زستان و تا مانگی مارس درێژە دەکێشێت.

من کاتی تێپەڕبوونم لە سەردەشت بە باشترین و شیاوترین شێوە لە لایەن حاکمی ئەم شارەوە (سەرتیپ فەڕۆخ‌خان)[1] خزمەتم کرا. ئەو حاکمە کە سەردەمێک لە قوتابخانەی سن سیر(St. Cyr) لە فەڕەنسا قوتابی بوو. فەڕوخ‌خان کە نەیدەزانی کاتەکانی چۆن بە سەر ببات، بیری لەم ڕۆژە خۆشانە دەکردەوە کە لە فەڕەنسا بە سەری بردبوو. ناوبراو ڕەنگە بۆ سەدەمین جار کتێبی - یەک ملیۆن ڕووداو- و ڕۆژنامە کۆنەکانی دەخوێندەوە.

---

١- «فەڕوخ‌خان» لەم کاتەدا ئێمەی ئاگادار کردەوە کە تێکهەڵچوونی توند لە ناو پشدەریەکاندا لە نێوان بەرزاییەکانی سلێمانی و ئالاندا ڕووی داوە. هەروەها ئەمەی ڕوون کردەوە کە ڕێگای سەردەشت بۆ هەولێر لە لایەن ڕێگرەکانەوە گیراوە و لەمەی کە ئێمە لە لایەن چەتەکانەوە کێشەمان تووش نەبووە سەری سوورمابوو. تەنانەت لە ناو شاری سەردەشت شەوانە چەند ئێشک گرێک دۆخەکەیان لە ژێر چاودێری دەگرت. چوار کەسی ئێرانی(عەجەم) کە ویستوویانە بەرەو کەربەلا بچن لە لایەن ڕێگرەکانەوە کوژراون. لە ساڵی ١٨٨٤دا کەسێکی ئەرمەنی -کە خەریک بە کۆکردنەوەی مازوو بووە- لە لایەن پشدەریەکانەوە کوژراوە و لاشەی ئەم ئەرمەنیە دوای ساڵێک لە لایەن م. ج. ا. گوتیە (شارۆمەندی فەڕەنسی) دۆزراوەتەوە کە خەریک بە لێکۆڵینەوەکانی لە ڕێگای مووسڵدا بووە. لە ماوەی چل ساڵی ڕابردوودا هیچ ئەورووپیەک بۆ ئەم بەشە لە کوردستان سەفەری نەکردووە. لەم سەردەمەدا کەسێکی فەڕەنسی و کەسێکی بەریتانی و کەسێکی ڕووسی و کەسێکی ئێرانی(عەجەم) و تورکێک خەریک بە دیاریکردنی سنووری زێی بچووک لە نێوان سەردەشت و پەسوێ بوون. شایەنی باسە ئەم کەسانە بە چەندین پارێزەرەوە پارێزگاریان لێکراوە (نووسینەکانی ١٠ی ئۆکتبەری ١٩٨٠ی ژاک دمۆرگان).

ڕووەکەکانی موکریان دەکرێت بۆ دوو دەستەی سەرەکی دابەش بکەین: یەکەم ڕووەکەکانی کوێستانی و دووەم ڕووەکەکانی دۆڵی ڕووباری زێی بچووک.

لە نزیک گوندەکان و لەم شوێنانەدا کە جۆگاکانی ئاو پیایدا تێپەڕ دەبن و شێی زیاتری هەیە بێستان و باخی زیاتری تیادایە و لە ناو دارەکاندا میوەی هەرمێ، کۆخ تەماتە و زۆرێک لە داری میوەکانی ئەورووپا بەرچاو دەکەون. هەروەها لە ڕیزی دوور و درێژدا داری سپیدار ڕیزیان بەستووە. لە بارەی بەر و بوومەکانی دانەوێڵەیی وەک گەنم و جۆ و ماش دەبێت بڵێین کە ئەم بەر و بوومانە دەوری گوندەکانیان داوە. لە پشتی جۆگاکانی ئاو واتا لە شوێنە دێمەکارەکاندا بەر و بوومی ئەوتۆ نەچێندراوە و گەشەی نەکردووە. ڕووەکە سروشتیەکان لەم شوێنانەدا بە شێوەی پەرش و بڵاو بەرچاو دەکەون.

لە حاڵێکدا کە کوێستانەکان وشک و کەمئاون، بەڵام بە پێچەوانەوە دۆڵی ڕووباری زێی بچووک بەراو و ئاوی زۆری هەیە. بەڵام بەرەو باشوور کە زەویە تەختەکان کۆتاییان پێدێت ئەوا دارستانەکان دۆڵ و بەرزاییەکان تا بەرزی ۲۰۰۰ مەتری دادەپۆشن. ئەم دارستانانە چەند جۆرێک لە داری بەڕوو و مازوو و گوێژ لە خۆ دەگرن. گشت دارەکانی ئەم دارستانانە کورتە باڵا و بە شێوەیەکی ناسروشتی و خراپ گەشەیان کردووە و هۆکارەکەشی بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە کە لە وەرزی بەهاردا شوانکاران بەشی ساوا و تازەی دارەکان دەبڕن و بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکان کەڵکیان لێوەردەگرن. لە وەرزی هاویندا کە گەڵا و بەرگی دارەکان هێشتا نوێ و پانن، شوانکاران جارێکی تر هەڵمەتە وێرانکاریەکانیان دەست پێدەکەنەوە و لق و پۆی دارەکان دەبڕن و بۆ بەرگرتن لە نەبوونی خۆراکی ئاژەڵەکانیان لە وەرزی زستاندا ئەم سامانە ڕادەگرن. ئاژەڵە بێدەسەڵاتەکانیش گەڵاکان دەخۆن و تەنانەت ئەو

بەشە لە قەدی دارەکەش کە بتوانن قووتی دەدەن.

جگە لە بەرهەمی بەڕووی نەرم کە بۆ کوردەکان وەک سەرچاوەیەکی خۆراکییە داری بەڕوو ئیستفادەی تریشی بۆ دانیشتوانی ناوچەکە هەیە و ئەویش مازوویە کە ئەم دارە بڕێکی زۆر لە مازوو دەگرێت. ئافرەتان و منداڵان بۆ چنینی ئەم بەرهەمە ڕوو لە دارستانەکان دەکەن و دواتر لە لایەن پیاوی ماڵەوە ئەم بەرهەمە بەرەو بازاڕی شاری سابڵاغ دەبردرێت و دەفرۆشرێت.

لە موکریاندا ڕووەک و دارەکان ئاگریان تێبەرنادرێت بۆیە مەجالی گەشە و هەڵدانیان هەیە. هەروەها چوونکە لق و پۆی دارەکانیش زۆرجار تووشی بڕین دەبنەوە ئەوا لقەکان زۆر و بێ ژمار دەبن. هەندێ جار لە شوێنە نزم و قووڵەکاندا دارستانەکان بە ڕادەیەک چڕن کە چوونە ناوەوەیان زەحمەتە. کەواتە ناشێت بڵێین کە خاکی ناوچەکە خۆی بۆ گەشەی دارەکان نەگونجاوە، چونکە لە شوێنەکانی وەک ئەسحابە و قەبرستانەکاندا کە دارەکان هەرگیز نابڕدرێن ئەوا دارەکان تا ڕادەیەکی زۆر بڵند و بەرز بوونەتەوە. تەنانەت من داری وەهام لە ناویاندا بینیوە کە لە ڕووانگەی بەرز و بڵندیەوە لەگەڵ جوانترین دارەکانی بە ڕووی ئەورووپادا بەراورد دەکرێن! لە ناوچەی بانە وێرانکاری دارستانەکان کەمتر لە سەردەشتە. هۆکارەکەشی بۆ بوونی بڕێکی زیاتری ئاو لە بانە و شێدارتربوونی ناوچەی بانە دەگەڕێتەوە. هەروەها لە دەور و پشتی کۆمەڵگا نیشتەجێ بووەکانی ناوچەی بانە لەوەڕگای زۆر و دەوڵەمەندتری تیادایە و بۆیە شوانکارانی ئەم ناوچەیە ئاژەڵەکانیان زیاتر لەم لەوەڕگایانەدا دەلەوەڕێنن. کە وابوو دارستانەکان باشتر دەمێننەوە.

گرنگترین ئاژەڵە کێوییەکانی موکریان بریتین لە: ورچ (کە زیاتر لە

ئەشکەوتەکاندا و لە نزیک لووتکە دوورەکان وەک دوورخراوەکان ژیان بە سەر دەبەن)، بزنی کێوی و ئاسکە کێوی (کە لە ناوچەی بانە ژمارەیەکی زۆری لەم ئاژەڵانەی تیادایە)، بەراز (کە زەرڕ و زەرەری زۆری بۆ دارەکان و باخەکان لە ناوچەکەدا هەیە)، کەرویشک، گورگ، ڕێوی و باڵندەکانی وەک کەو، مراوی، قاز و... هتد.

ئاژەڵە ڕامکراوەکانی ناوچەی موکریانیش هەمان ئاژەڵەکانی ناوچەکانی دەور و پشتن. بەڵام سەگەکانی ناوچەی موکریان و بە تایبەت هی گوندی بەیرەم ناوبانگیان هەیە. ئەمانە ئاژەڵاتێکی جوان و بەهێزن و گەورەکانی کورد بۆ ڕاوکردنی ورچەکان کەڵکیان لێوەردەگرن.

لە موکریاندا ئاژەڵە مەترسیدارەکان زۆر کەمن. هەر چەندە کە مار لە موکریاندا بوونی هەیە، بەڵام بە دەگمەن ڕێبوارەکان لەگەڵیاندا بە یەک دەگەن. هەروەها دووپشکی موکریان ڕەنگی زەرد و لاشەیەکی زۆر بچووکیان هەیە.

## دانیشتوان[1]

١- دمۆرگان: ئێمە هێشتا لە دوو مایلی سابلاغین و بۆ حەوانەی شەو بۆ لای خدراغا، کوێخای گوندی ئەگریقاش هاتووین. لەگەڵ گەیشتنمان بەم گوندە پیاوێک وەک ڕێنوێنیکەر پێمان گەیشت ئێمەی بۆ حەوشەیەکی گەورە ڕێنوێنی کرد کە نزیک بە پازدە تاوس لەم حەوشەیەدا هاتوچوونیان دەکرد. خدراغا کە لە بەردەم ماڵی خۆیدا دانیشتبوو زۆر بە گەرمی ئێمەی قبووڵ کرد و بەرەو ژوورەوە خوڵقمانی کرد. سەرەتا بە حەوشەیەکیتر کە بە گوڵ ڕازابوویەوە گەیشتین و دواتریش بۆ ژوورەوە کە لاکێشە و ڕاخەر تیایدا ڕاخرابوون. خانەخوێکەمان خدراغا هەندێ جار بە فارسی و هەندێ جار بە تورکی لەگەڵماندا قسەی دەکرد. دوای کەمێک خدراغا بەرەو ژووری خۆی ڕۆیشت و بەردەستەکانی سینی پڕ لە میوە و شەربەتیان بۆمان هێنا. خدراغا کە پیاوێکی پیری باڵابەرز و سمێڵسپی بوو لە گەورە پیاوانی کوردی زۆر بەڕێز بوو. کاتی خەو هات، ئێمە کە ویستمان بخەوین لە ناکاو تەپۆ و مێشوولەکانی موکریان هێرشیان بۆمان هێنا. هاوکات لەگەڵ

دانیشتوانی موکریان هەر چەندە کە لە چەند خێڵێکی جیاواز پێکهاتوون، بەڵام گشت دانیشتوانی ئەم ناوچەیە لە یەک ڕەگەزن و بە یەک زمان و زاراوە دەدوێن و قسە دەکەن. بەڵام لەم ڕوانگەوە دەبێت ناوچەی سەقز جیا بکەینەوە کە بە زاراوەیەکی تێکەڵ لە موکری و سنەیی دەدوێن. سەقز لە نێوان ناوچەی کوردستانی موکری و کوردستانی سنەدا هەڵکەوتووە و لە ڕووی جوگرافیەوە بە بەشێک لە موکریان دەناسرێت بۆیە لێرەدا باسی لێوە دەکەم.

کوردەکانی موکریان بۆ دوو دەستەی نیشتەجێ و کۆچەری دابەش دەکرێن.

کوردە نیشتەجێ بووەکان لە نێوان چیای کورتەک تا ڕووباری جەغەتوو بڵاو بوونەتەوە. لە ماوەی پەنجا ساڵی ڕابردوودا ئەوانیش کۆچەری بوون و لە ژێر خێوەتەکاندا دەژیان بەڵام دواتر گوندیان پێک هێنا و نیشتەجێ بوون و ئێستاکە گەر لە کوێستانەکاندا خێوەت بەرز دەکەنەوە و لە ژێریدا دەژێین تەنیا بۆ پارێزگاری کردنیان لە ئاژەڵەکانیانە. واتا لە وەرزەکانی پاییز و زستان و بەهاردا بۆ ماڵی خۆیان دەگەڕێنەوە.

شەڕ و تێکهەڵچوونەکانی نێوان خێڵەکانی موکریان لە یاد چوونەتەوە. بە دڵنیاییەوە دۆخی دۆڵی زێی بچووک وەک شوێنەکانی تر کە بەردەوام

---

ئەمەشدا دەنگی وەڕینی سەگەکانی دەرموەمان بە گوێ دەگەیشت. دواتر دەنگی گۆرانیبێژی شەوانەی خدراغا دەستی پێکرد. دەرکەوت کە خانەخوێی ئێمە واتا خدراغا شەوانە وەک ئێرانی(عەجەم)ەکان بە مۆسیقا یا گۆرانی دەخەوێت. گۆرانی بێژ هەندێ جار بە چریکە و هەندێ جار بە دەنگێکی نارامترەوە گۆرانی بۆ خدراغا دەگوتەوە. هەندێ جاریش چەند کۆپلەیەک کە گۆرانیبێژ پێی وابوو باشتر خدراغا بەرەو خەو دەبات دەیگوت. لە لایەکیتریشەوە دوو بەردەستیتر قاچ و قولەکانی خدراغایان دەشێلا. هێواشهێواش خدرا خەو دەیباتەوە و بەردەستەکانی دوور دەکەونەوە. ئیتر نە مێشوولەکان و نە دەنگی سەگەکان خدراغایان پێ خەبەر نابێتەوە (نووسینەکانی ژاک دمۆرگان، ١٠ی سپتامبری ١٨٩٠).

تێکهەڵچوونی تیادایە نییە.[1]



شێوەی ٩-سوارکارانی کوردی سابلاغ

گەورەکانی کورد بۆ وەرزە ساردەکان لە ناوچە گەرمترەکاندا شوێنی

---

١- لە کاتی شەودا لە گوندی شیناوێ لە ناوچەی مامەشەکاندا ئاگرێک کەوتەوە. دەگوترا مەنگوڕەکان ئاگریان خستۆتەوە. ئەم ڕووداوانە لای کۆچەرییەکان هەیە. هەندێ لە خێڵەکان لە دژی خێڵەکانی‌تر لە شەڕن. چەند ڕۆژ لەمەوبەر بوو کە لە گوندی پەسوێ پۆلەگەنمی گوندەکەیان لە بەردەم ماڵی حەمەدئاغای کوێخای گوندەکە ئاگر درا. لەگەڵ کەوتنەوەی ئاگرەکەدا ئاگرتێبەردەران ڕادەکەن و بەرەو کوێستانەکان دەڕۆن. ئەم ئاگرتێبەردانانە بەردەوام لە کاتی هاتنی بای توندا ڕوو دەدەن. لەم کاتانەدا هاوسێکان بۆ یارمەتی یەکتر دەچن. دوای کەمێک گوێبیستی چەند تەقە کردنێک بووین. سەر لە بەیانی هەواڵی ئەمە هات کە ئاگرەکە لە ماڵی کوڕی حەمەدئاغا بەردراوە. کەمێ دوورتر لەم شوێنە هەواڵی ئەوە هات کە جارێکی‌تر ئاگر لە گەنمی مامەشەکان بەردراوە (ژاک دمۆرگان، ١٢ی ئۆکتۆبەری ١٨٩٠).

حەوانەوەیان بۆ خۆیان درووست کردووە. بەڵام لە وەرزەکانی تردا بۆ شوێنەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە و لە ناو مەزرایەکاندا خێوەت بەرز دەکەنەوە و ئاژەڵەکانیان بۆ ئەو شوێنانە دەبەن.

لەگەڵ توانەوەی بەفرەکان لە بەشی سەرووی دۆڵی ڕووباری زێی بچووک ئەوا لە بەشەکانی خواروو مەڕ و ماڵات و ئاژەڵەکان بڵاو دەبنەوە. دواتر کە هێواش هێواش بەفری بەرزاییەکانیش دەتوێتەوە، ئاژەڵداران لە ماڵەکانیان دەردەکەون و خێوەتەکان بەرز دەکەنەوە و لە کاتی گەرمادا تا لووتکە بەرزەکان دەچن. لە سەرەتای پاییزیشەوە ئەم پرۆسە بە شێوەیەکی پێچەوانە ڕوو دەدات. تا مانگی سپتامبر ئەم پرۆسە بە تەواوی بە ئەنجام گەیشتووە.

کۆچەریەکانی بەشی موکری تا ڕادەیەکی زۆر یەک شێواز و شێوەیان هەیە. ئەوان خەڵکانێکی جوان و باڵایەکی مامناوەند و شان پان و سنگێکی لە پێشیان هەیە. ئەوان زۆر ڕێکوپێک و سەریان بچووکە، قژیان ڕەش و لێک ئاڵاو و نێو چاوانیان بڵند و پانە، کەپۆی هەڵۆیی و چاوی ڕەش و گەورەیان هەیە. برۆی پڕ و ڕەش و ڕوومەتی خڕ و سوور ڕەنگ و ڕەنگی پێستی بۆری بڕۆنزی لە تایبەتمەندیەکانی تری ئەم خەڵکانەیە. ئافرەتانیش هەمان تایبەتمەندیان تیادا بەدی دەکرێت و زۆر جوان و ڕێکوپێکن و لە ڕووی هزر و هۆشەوە زۆر لە ئافرەتانی ئێرانی (مەبەست لە ئافرەتانی غەیری کوردە) لە پێشترن.

جلوبەرگی پیاوان لە پانتۆڵێکی فەڕاح و کراسێکی قۆڵ فەڕاح پێکهاتووە کە گەر قۆڵەکانی هەڵنەدرێتەوە تا نزیک ئەژنۆکانیان دادەکەوێت. زۆر جار کۆتێکی ڕازاوە و ئەستوور کە قۆڵی پێوە نییە لەگەڵ ئەم جلوبەرگانەدا لە بەر دەکرێت. پیاوان هەروەها جامانەیەک کە بە جوانی دەپێچرێتەوە لە دەوری سەریان دەهاڵێنن.

جلوبەرگی ئافرەتانیش لە تەنوورەییێکی کورت و قوماشێکی رەنگاورەنگ پێک دێت کە لە دەوری خۆیانی دەهاڵێنن. ئافرەتانیش مەندیلە لە سەریان دەهاڵێنن، بەڵام هی پیاوان لە رەنگی سپی و هی ئافرەتان لە رەنگی شین یا سوورە.

لە ناو کوردە نیشتەجێ بووەکاندا پیاو بە کشتوکاڵ و ئافرەتان بە ئیشی ماڵەوە خەریکن، بەڵام لە ناو کوردە کۆچەریەکاندا بە پێچەوانەوە ئافرەتان و منداڵان گشت کارەکان جێبەجێ دەکەن و پیاوان خەریک بە ئیسراحەت و یا شەڕ و تێکهەڵچوونن. کۆچەریەکانی دەور و پشتی رووباری زێی بچووک (کەڵوێ) بۆ چەند خێڵێک دابەش دەبن و هەر یەک لەم خێڵانە پارچەیەک لەوەرگا و زەویان لە بەر دەست دایە.[1]

بۆ نموونە خێڵی مامەش لە باکوور واتا لە دۆڵی رووباری لکێن و کەڵوێ تا رووباری بادیناوێ بڵاو بوونەتەوە. سەرۆکەکەیان حەمەدئاغایە کە لە وەرزی زستاندا لە گوندی پەسوێ نیشتەجێیە. سنوورەکانی ئەم خێڵە بەم شێوەیەن: لە باکوور بەرزاییەکانی کە بە هۆیەوە ئاوەکان بۆ دوو حەوزی رووباری گادەر و کەڵوێ دابەش دەبن، لە رۆژئاوا سنووری سیاسی عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ)، لە باشوور رووباری بادیناوێ و لە رۆژهەڵات بەرزاییەکانی یاکوباوێ. ئەم خێڵە زۆر جار لە لایەن مەنگوڕەکانەوە کە خێڵی هاوسێیانن تاڵان کراون.

---

١- سەرۆکی ئەم خێڵانە لە لایەن حاکمی ساباڵاغەوە دەست‌نیشان دەکرێن. سەرۆکی خێڵەکان لە ساڵی ١٨٩٠دا بەم شێوەیەن: (خێڵی مامەش = حەمەدئاغا)، (خێڵی مەنگوڕ = کاک ئەڵڵاغا)، (خێڵی دارمێ = حەمەدئاغا)، (خێڵی ئالان = عەلی ئاغا)، (خێڵی گەورک = خدرئاغا)، (خێڵی مەلکەڕی = جوانمێرئاغا)، (خێڵی هەرزەلان = هەباس ئاغا)، (خێڵی باسکی کۆڵەسە = لە شەش ساڵی رابردوودا بێ سەرۆک بووە.)



شێوەی ١٠- ئیزەدولاغای رەیسی کوردی موکری (کولەپە)

بەشێک لە دۆڵی هەڵکەوتوو لە نێوان ڕووباری بادیناوێ و چیاکانی وەزنێدا شوێنی حەوانەی گێرەشێوێن‌ترین خێڵ واتا مەنگوڕەکانە. چەند ساڵ لەمەو بەر سەرۆکی ئەم خێڵە هەمزەئاغا بوو کە بە سەرۆکایەتی ناوبراو لە سەرهەڵدانێکدا مەراغە و ورمێ و تەنانەت تەوریزیش وێران کران. کوڕی سەرۆکی یاغی کە بە فەرمانی ئەمیر نیزام حاکمی پێشووی ئازەربایجان لە دەسەڵات لادرا و کەم ئەندامیش کرا ئێستاکە لە گوندی خۆیدا واتا لە وەرمیشان نیشتەجێیە لە حاڵێکدا کە سەرۆکی نوێ واتا کاک ئەولاغا لە وەرزی زستاندا لە بادیناوێ یا لە ترکەش[1] دەمێنێتەوە.

---

١- گوندی ترکەش کە لە ساڵی ١٨٨٨دا بنیاد نراوە لە نزیک گوندی بادیناوێ هەڵکەوتووە و سەرۆکی خێڵی مەنگوڕ لەم گوندەدا دەحاوێتەوە. پێشتر ئاغا لە گوندێک لە گوندەکانی



شێوەی١١-ئۆردوگای کۆچەریەکانی دەور و پشتی سابلاغ، (وێنە: سەیفەدین خانی سەردار).

لە ناوچەی مەنگوڕەکانەوە دارستانەکان دەست پێدەکەن، بەڵام لە ناو گەورکەکاندا بایەخ و نرخی ئەم سامانە زیاتر و لە بەرچاوە و لای مەنگوڕەکان دارستانەکان گرنگیەکیان نییە. سنووری گەورکەکان لە باشوور نادیارە، بەڵام لە باکوور بە هۆی ڕووبار و چۆمەکان دیار و لە بەرچاوە.

لە ڕابردوودا و سەردەمانی پێش ئێمە خێڵی گەورک و مەنگوڕ شەڕ و تێکهەڵچوونیان لەگەڵ یەکتردا هەبووە. لەو سەردەمەدا سیلاحی وەک تفەنگ بەم

---

بەرزاییەکانی برایمە ڕەشان دا دەمایەوە. بەڵام لەو کاتەوە کە حاکمی ساباڵاغ کاک ئەڵڵاغای وەک سەرۆک ناساندووە ئەوا سەرۆک لە ترکەش نیشتەجێ دەبێت. ئێمە لە ماڵی ئەودا بۆ دیتنی باپیرئاغا کوڕی هەمزەئاغا (سەرۆکی پێشووی سەرهەڵدانەکان) و حەمەدئاغا (دوژمنی سوێند خواردووی مامەشەکان) دەچین. نێزە و جلوبەرگەکانی ناوبراو لە خوێنی ئەو سێ هەزارەدا شەڵاو بووە کە شەوی ڕابردوو کوشتوونی، بەڵام لە بارەی باپیرئاغاوە دەبێت بڵێین کە سێ ساڵ لەمەوبەر کۆشکەکەی بە هۆی بەرکەوتنی قومبەڵەی تۆپەوە وێران بووە و لەو کاتەوە شوێنێکی جەوانەی جێگیری نییە و بە درێژایی ساڵ لە ژێر خێوەتدا ژیان بە سەر دەبات (نووسینی ١٣ی ئۆکتۆبەری ١٨٩٠ی ژاک دمۆرگان).

ناوچانه نەگەیشتبوو و شەڕکەران بە تیروکەوان لەگەڵ یەکتردا لە شەڕدا بوون. هەروەها لەو سەردەمەدا بۆ پارێزگاری خێڵ لە هەر دوو لای ڕووبارە سنووریەکاندا گوندەکان درووست دەکران، و هەوڵ دەدرا تا شوێنی گوندەکە بە جۆرێک بێت کە لە تیرهاوێژی دوژمندا نەبن. بەڵام لەم ڕوانگەوە کە ڕۆژ بە ڕۆژ مەیدانی تیرهاوێژی دوژمن زیاتر و بەربڵاوتر بوو ئەوا گوندەکان لە یەکتر دوور کەوتنەوە و ئێستاکە نزیکترین شوێنەکانی ئەم دوو خێڵە لە یەکتر لە لای گەورکەکانەوە گوندی نێزە و لە لای مەنگوڕەکانەوە گوندی عەلیاوایە. ئەم دوو گوندە نزیک بە هەشت کیلۆمەتر لە یەکتر دوورن. لە ناو ئەم دوو گوندەدا کەلاوەی شوێنەکانی نیشتەجێ بوون و دارەکانی میوە کە لە ناو چوون بەرچاو دەکەوێت.[1]

---

١- کۆچەریەکانیش هەرگیز بەرەو ناوەوەی سنووری خێڵی هاوسێیان ناچن. تەنانەت ڕێنوێنیکەرەکانیش توانای ئەم کارەیان نییە. ئەوان لە چەند سەد مەتری سنوور دەوەستن و زۆر بە وریاییەوە جموجۆڵ دەکەن. بۆ نموونە مەنگوڕەکان لە باکوورەوە هەرگیز ڕووبار (چۆم)ی بادیناوێ تێپەڕ ناکەن مەگەر ئەوی کە ژمارەیان زۆر بێت و یا خود ئەوەی کە بۆ شەڕ بچن. بەم شێوەیە لە نێوان مەنگوڕ و گەورکەکاندا زەوی زۆری تیادایە کە شێوازی ناوچەیەکی ئینتیقالی واتا گواستراوەیان هەیە. لە سنووری عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ)وە مەنگوڕەکان زیاتر بە پشدەریەکان دەگەن و زۆر جار تێکهەڵچوون لە ناویاندا ڕوو دەدات. لەم شێوە شەڕ و تێکهەڵچوونانە لە ناو بنەماڵەکانیشدا بەدی دەکرێن. هەر کەسێک بە ڕادەیەک حەسوودی و بەرچاوتەنگی تیادایە، برا لەگەڵ برا یا خود کوڕ لەگەڵ بابدا. گەر حکوومەتی ئێران ئیمتیازێک بە سەرۆک خێڵێک بدات ئەوا دەبێت هەمان ئیمتیاز بە سەرۆکەکانی تریش بدرێت و گەر وانەبێت شەڕ و ئاڵۆزی ڕوو دەدات. مەنگوڕەکان ساڵانە ٥٠٠ تمەن واتا ٣٥٠٠ فرانک دەبێت باج بدەن. سەرۆکەکەیان واتا کاک ئەڵلاغا بەرپرسی ئەم باجانەیە. کەواتوو ناوبراو پارە (باج)کان کۆ دەکاتەوە و بە حکوومەتیان دەدات. گەر ٥٠٠ تمەن بە سندووقی حاکمی سابڵاغ نەگات سەربازانی ئێرانی(عەجەم) بەرەو خێڵ هێرش دەبەن و لەم حاڵەتەدا کۆچەریەکان بۆ چیا سنووریەکان ڕادەکەن. لەم ڕووەوە هەندێ لە خێڵەکان بەرەو ناوەوەی عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) ڕایان کردووە و هەرگیز نەگەڕاونەتەوە. بەڵام ئەوان دوژمنانی سەرەکیان لە بیر ناکەن و هەندێ جار سنوور دەبەزێنن و تاڵانی گەورکەکان دەکەن (نووسینەکانی ١٥ی ئۆکتۆبەری ١٨٩٠ی ژاک دمۆرگان).



شێوەی ۱۲- بابیر ئاغا. كوڕی هەمزاغای ڕەیسی مەنگوڕەكان

تا نزیک سنووری باشووری گەورکەکان هەر دوو خێڵ (گـەورک و مـەنگوڕ) هەر دوو لای کەنارەکانی کەڵوێیان لە بەر دەستدایە. لە بەشی باشوورتر ڕووبـاری زێی بچووک (کەڵوێ) خۆی حوکمی سنووری هەیە.

لە کەناری چەپ کەلهووڕەکان حەواونەتەوە کە تا سنووری بانە بڵاو بوونەتەوە. لە لای ڕاست خێڵەکانی باسکی کۆڵەسە و لە کوێستانەکاندا خێڵـەکانی دارمـێ و هەرزەڵان و مەلکەڕیەکان[1] و ئالانیەکانن. ئەم خێڵانەی دوایی ڕێگاوبانەکانی دۆڵی

---

۱- حاکم و سەرۆکەکان لە بەرامبەر کۆچەریەکاندا ناچارن کە تا دەتوانن توندوتیژی بە کار بهێنن. بەم دواییانە فەڕوخ‌خان چوار چەکداری خێڵی پشدەری گرت و تا ڕادەیەک ئەشکەنجەی کـردن کە نینۆکی دەستەکانیان وەریـوون. لـە سبەینێـی ئـەم ڕۆژەڕا ئەشـکەنجەی ئـەم چەکدارانـە بـە شێوازی‌تر و لە لای سەریانەوە دەستی پێکرد. دواتر چەند ڕۆژ بەم شێوەیە دەست بە سەر بوون و دواتر کە برینەکانیان کرمەخۆرە بوون بەرەڵا کران تا بەرەو خێڵەکەیان بگەڕێنەوە. ئەمە لـە ڕووی

زێی بچووک دەپارێزن. ئەوان لـە سنوورەکان بـە ئەسپەکانیان هـاتوچۆ دەکـەن. هەندێکیان لە داوێـنی بەرزاییـەکانی کونەکێـەچن و دانیسـووی کـەناری چـەپی ڕووباری زێی بچووکن. هەندێکی‌تر لە داوێـنی چیـای هومـل و کـەناری ڕاسـتی ڕووباری ناوبراو حەواونەتەوە. لە بەرامبەر ئەمانەدا لە عوسمانی (عێـراقی ئەمـڕۆ) پشدەریەکان[1] جێگیربوون کە لە خێڵە زۆر ئاڵۆزەکان بە ئەژمار دێن.



شێوەی ١٣ – کاک ئەلاغا ڕەییسی مەنگوڕەکان

مامەش و مەنگوڕەکان کەمتر لەم خێڵانە ئاڵۆزی دەنوێنن. بەڵام خێڵەکانی کـە لە چیاکانی باشووردا ژیان بە سەر دەبەن، خوو و ڕەوشـتی سـەرەتایی و ئاڵـۆزی

باشی و چاکی حاکم نەبوو کە بەرەڵا کرابوون. بەڵکو بـۆ ئەمـە بـوو کـە بـەرەو خێڵـی خۆیـان بگەڕێنەوە و بۆیان باس بکرێت و ببینن کە دوچاری چ بەڵا و ئەشکەنجەگەلێک بوونەتـەوە. ئـەم کردارانە تەنیا لە حاکمێکی ناوچەکە دەتوانرێت ببینرێت. گەر حاکمێـکی ئێـرانی(عەجـەم) وەهـا کردارێک بنوێنێ بە زوویی لە لایەن خەڵکەوە نوشی کوشتن دەبێتەوە.

١– پشدەر بە واتای نیشتەجێ بوو لە دۆڵی بچووکدا دێت.

خۆیان زیاتر پاراستووه و دەسەڵاتی ئێرانی زۆر به زەحمەت تەحەمول دەکەن بۆیه زۆر جار هێرش کردنه سەر حاکمی سەردەشت ڕوو دەدا و بەرچاو دەکەوێت[1]

بەدڵنیاییەوه سەرەتاییترینی خێڵەکان، خێڵی دارمێن که له ناوچه شاخاویەکانی دەور و پشتی خۆیاندا ژیان بەسەر دەبەن. خۆراکیان بەڕوویه و له وەرزی زستاندا بۆ خۆ حەشاردان له سەرمای زستان پەنا بۆ گەڵا و بەرگی دارەکان دەبەن که له ئەشکەوتەکاندا حەمباریان کردوون. لەگەڵ ئەمەشدا لەم ناوچەیه چەند گوند و یا باشتره بڵێین که چەند کۆمەڵه کۆخێک بوونیان هەیه که بریتین له: شوباشو و سیرەمێرگ و دارمەکۆن و بوبانه و بێورێ و... هتد.[2]

---

١- هەروەها مەلکەریەکان ساڵانه ١٢٠٠ تمەن واتا ٨٤٠٠ فرانک باجیان له سەره و ئەم بڕه بۆ دانیشتووانی ئەم ناوچانه زۆر و بەرچاوه که ئەم بڕه پاره له فرۆشتنی مازوو به دەست دەخەن.

٢- خێڵی کوێستانه بەرزەکان له خراپترین دۆخدا به سەر دەبەن و هەژارترینی ئەم خێڵانه دارمەیەکانن که له کۆخەکاندا ژیان به سەر دەبەن و شتێکی‌تر جگه له گەڵا و بەرگی دارەکانیان نییه که تیایدا بخەون. ئەم گەڵا و بەرگانه له دەوری ئاگرێکه که له ناوەندی ژوورەوەدا کراوەتەوه و دانیشتووانەکان دەوری دەدەن. جلوبەرگی ئەم خێڵه له پەشمی سروشتی قاوەیی ڕەنگه و تەنیا له دوو پارچه پێک دێت که یەکێک وەک کراس و ئەوی‌تریان وەک پانتۆڵ به کار دەهێنرێت. ئێمه که بۆ دیتنی کاروانێکی دارمەیەکان ڕۆیشتبووین پیاوەکانیان تا حەددێکی زۆر ڕووت بوون. بەڵام گشت دارمەیییەکان چەکدار بوون. کەسێک له خێڵی دارمێ که له دۆخێکی زۆر باشدا به سەر ببات ئەوا ساحێبی ئەسپێکه. ئەسپ له ناوچەی وەزنێ ئاژەڵێکی نەناسراوه، بەڵام ئافرەت لەم ناوچەیەدا کاری قورس دەکات و شتومەک دەگوازێتەوه. له خێڵه کوێستانیەکاندا منداڵەکان زۆر و له ئەژمار نەهاتوون. بنەماڵەی وەها له ناویاندایه که له بەری چوار یا پێنج دایک نزیک به سەد کوڕیان هەیه. له بەشی هەرزەلان گوندێک هەیه که تیایدا جگه له سێ بنەماڵه (به کوڕ و کچ و نەوەکانیانەوه) تەنیا یەک پیاو هەیه که هێشتا خۆی زیندوویه، ئەم گوندە لەم سێ بنەماڵەیه سەد و سێ ماڵ و شەش سەد و پەنجا کەس دانیشتووی لێکەوتۆتەوه. له ناو دارمێ و تالان و هەرزەلانیەکاندا بنەماڵەکان له ڕووی ژمارەوه زۆرن، بەڵام لەم ڕووەوه مەنگوڕ و مامەشەکان کەمترن. ئەمانه کەمتر چەند نافرەتیان هەیه و منداڵیشیان کەمتره. له بەرامبەردا دارمەیەکان لاوازتر و له هونەر کەم دەزانن، بەڵام له ڕۆیشتن و ڕێپێواندا له ئاستێکی بەرز و پێشەوەدان.



شێوەی ١٤- شوێنی حەوانەوەی ڕەییسی مەنگوڕەکان، (وێنە: سەفەدین خانی سەردار).

شوێنی حەوانەوەی حاکمی سەردەشت لە شوێنێک هەڵکەوتووە کە بە سەر دۆڵی ڕووباری زێی بچووکدا دەڕوانێت. لە نزیک ئەم شوێنە گوندێک هەڵکەوتووە کە بە باسکەدوو ناسراوە و لەگەڵ ئەوەدا کە لە ژێر دەسەڵاتی هەمان خێڵی سەردەشتدایە، بەڵام مەلکەڕیەکان تیایدا نیشتەجێ بوون.

خێڵی ئالان کە لە شێوەی دارمەییەکان لە چیا دووردەستەکاندا جێگیر بوون بەراورد دکرێت هەر وەک دارمەییەکانیش دواکەوتوو بن، بەڵام لە ڕاستیدا بەم شێوەیە نییە و ئەوان زۆر پێشکەوتووترن و کشتوکاڵ لای ئەوان زیاتر گەشەی کردووە و هەروەها ژمارەی گوندەکانیان زیاترە.

لە ناوچەی نێوان کۆیی سنجق و ڕەواندز و سنووری ئێران ئەو خێڵە کوردانە نیشتەجێن کە بە هەمان زمانی موکریانی دێنە ئاخافتن و لە ناو دارستانەکانی دەور و پشتی ناوچەکانی خۆیاندا حەواونەتەوە. بەداخەوە من نەمتوانی جگە لە چەند زانیاریەکی کەم لە بارەی ژمارەی ئەوانەوە، زانیاری ئەوتۆ بە دەست بهێنم، بەڵام

لـەوە تێگەیشـتم کـە خێڵـی سـەرەکی و گرنگـی ئـەو ناوچەیـە هـەمان خێڵـی پشدەریەکانە. پشدەریەکان ئەو خێڵەن کە زۆر جار بەفری بەرزاییەکان دەبڕن و بـۆ ناو خاکی ئێران دێن و تیایدا ئاژاوە دەنێنەوە یا خود شتومەک دەڕفێنن.[1]

لەگەڵ بەرزی چیاکاندا و هەروەها سەختی سنوورەکان و گۆشەگیری هەندێک لە خێڵەکان کە بەردەوام لەگەڵ یەکتردا لە شەڕ و تێکهەڵچووندان، بەڵام گشت ئەو خێڵانە بە یەک زمان و زاراوە دەدوێن و قسە دەکەن کە بە ڕای من ئـەوە نوێـنەری ڕەسەنترین زاراوەی زمانی کوردیە. من لە باسێکی تایبەت بە موکریاندا ئەم لایەنـە ڕوون دەکەمەوە.

لە ناو وشەکانی ئەم زمانەدا زۆرێک لە وشـەی دەرەکـی فارسـی و تـورکی و عەرەبی بەرچاو دەکەون کە نموونەی ئەوان بریتین لە:

وشە عەرەبیەکان وەک: کتاب، مەکتەب، قەلەم، ئەڵڵا، ئەمیر، حەیوان، سـەباح و جیران.

وشە ئێرانی (فارسی)ەکان وەک: سەد، هەزار، مار، کۆتر (کەبوتەر)، ماسی، بادام و ئەسپ.

وشە تورکیەکان وەک: کۆچ، ئاغا، ساغ، پیشکە (پشیلە) ، قۆناغ و قاز.

لای ئێرانی و کوردەکان کـە بـە هـۆی عەرەبەکانـەوە ئـایینی ئیسـلامیان پـێ قەبووڵێندراوە، تەنیا هۆکاری تێکەڵاوبوونی وشە عەرەبیەکان لەگەڵ ئـەو زمانانـەدا

---

١- لە ئێراندا سەرۆکی خێڵەکان لە بەرامبەر ئەو ڕووداوانەدا کە لە نـاو خێڵـەکەیاندا ڕوو دەدات بەرپرسیارن. گەر مەترسی یا ڕووداوێک بۆ ئێرانی(عەجەم)یەک یا بۆ کەسێکی دەرەکی ڕوو بدات ئەوا سەرۆکی خێڵ بەرپرسە و بە توندی غەرامە دەکرێت. گەر غەرامە نەدرێت ئەوا سەرۆکی خێڵ دەست بە سەر دەکرێت و ئەشکەنجە دەدرێت تاوەکوو غەرامەکە بدرێـت، دواتـر سـەرۆک ئـازاد دەکرێت. شایانی باسە لەم ماوەیەدا لە لایەن سەرۆکەوە جێگرێک لە شوێن ئـەودا دەسـتنیشـان دەکرێت.

بۆ ئەمە دەگەڕێتەوە. هەر وەک دەبینین کە نوێژ و عیبادەت و پاڕانەوەکانیشیان بە زمانی عەرەبییە. هەندێ نموونە وشەی ئەم زمانە بریتین لە:

پیاو، کچ، شیو، ئانشک، قامک، مافوورە، نێزە، مێتاڵ، هاوین، مەلۆتکە، دڕوو، قووڕ، گۆڕێ، شین، ڕەش، دەنک، کوون، دینەوە و گووتن.

لە ڕووی ڕێزمانەوە زاراوەی موکریانی زۆر لە ئێرانی واتا فارسی دەچێت، بەڵام فارسی زەند یاخود زاراوەی پەهلەوی نییە. نموونەش بۆ ئەمە سەرف کردنی کردارێک لە زەمەنە جیاوازەکاندایە.

نموونە:

| کوردی موکریانی | فارسی (ئێرانی) | کوردی موکریانی | فارسی (ئێرانی) |
|---|---|---|---|
| دەیکەمەوە | می‌گشایم | دەیکەیەوە | می‌گشایی |
| دەیکاتەوە | می‌گشاید | دەیکەینەوە | می‌گشاییم |
| دەیکەنەوە | می‌گشایید | دەیکەنەوە | می‌گشایند |

ئەمەش نموونەی کردارێک لە زمانی پەهلەوی ئێرانیدایە:

| تاک | | کۆ | |
|---|---|---|---|
| کەسی یەکەم | درم | کەسی یەکەم | دریم |
| کەسی دووەم | دری | کەسی دووەم | دریت |
| کەسی سێهەم | دریت | کەسی سێهەم | درند |

له زمانی زەندی فارسیدا پاشکۆکانی کـه زۆر جـار کەڵـکیان لێوەردەگیرێـت بریتین له:

| کۆ | | تاک | |
|---|---|---|---|
| ماهی | کەسی یەکەم | می | کەسی یەکەم |
| ت، تا | کەسی دووەم | هی، شی، ی | کەسی دووەم |
| ئـــەنتی، ئـــانتی، دینتی و... | کەسی سێهەم | تی، ائینتی | کەسی سێهەم |

ئەمانە لەگەڵ کردارەکانی زمانی فارسیدا زۆر ڕێکوپێک دێنەوە. بەڵام له زمانی کوردیدا پاشکۆ لکاوەکان بۆ کردارەکان بریتین له:

| کۆ | | تاک | |
|---|---|---|---|
| ئامان | کەسی یەکەم | م، ئام | کەسی یەکەم |
| ئاتان | کەسی دووەم | ت، ات، ایت | کەسی دووەم |
| ئەوان، یان | کەسی سێهەم | ئی، ی، ئێی | کەسی سێهەم |

ئەم جیاوازیانه زۆر گرنگن و لێکۆڵیاران به هۆیانەوە سەرنجیان بۆ زمانـەکانی پەهلەوی و زەند و تەنانەت هێندوئێرانیش ڕاکێش دەبێت.

من باسم لەوە کرد که زاراوەی موکریانی ڕەسەنترین شێوەزاری زمانی کوردیـه و من لەم ڕوانگەوە ئەمە دەخەمە ڕوو چونکه لـه گشـت ناوچـەکانی موکریانـدا و تەنانەت له ناوچه دوورکەوتووەکانیشدا زمانی دوان له یەک دەچێت و کارتێـکەری

زمانی دەرەکی لە سەری زۆر کەمە.

لە کوردستانی بەشی عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ)شدا بە هەمان شێوە بەم زمانە ئاخافتن دەکرێت و لەم ڕووەوە بەم دەرەنجامە دەگەین کە ئەم شێوازە لە موکریاندا لە هەر جێگەیەکی تر زیاترە و کوێستان و چیاکانی ئەم ناوچەیە (موکریان) زمان و داب و نەریتەکانی ئەم ناوچەیان باشتر پاراستووە.

پێشتر باسم لەوە کرد کە سەرەتا زۆرینەی کوردەکان کۆچەری بوون و دواتر بە لاسایی‌کردنەوەی ئێرانیەکان و هاوسێ مەسیحیەکانیان گوندیان هێنایە کایە. مێژووی ئەم ڕووداوە یا خود باشتر وایە بڵێین مێژووی ئەم گۆڕانە کۆنە و دیاری‌کردنی ئەم مێژووە ئاسان نییە. کوردەکانی ئەم ناوچەیە لەو سەردەمەدا کە ئەمیرخانی سەردار و سەیفەددین حاکمی موکریان خەریک بە فراوان‌کردنی سنووری دەسەڵاتی خۆیان بوون ئەم خواستەیان هێنایە بواری جێبەجێ کردنەوە. ناوبراو سەردارناوای بنیاد نا و بەم کارە گرنگیەتی بۆکانی زۆر زیاد کرد و دەور و پشتی بۆ دروست کردنی ژمارەیەکی زۆر گوند لە سەر زەویەکانیاندا هان دەدا.

لە وەها دۆخێکدا سەرسووڕهێنەرە کە شێوازی گوندی کوردەکان لەگەڵ هی تورکەکاندا لە یەک بچێت و لە سەر ئەم بنەمایە شێوازی ئەم گوندانە تەواو لەگەڵ هی یەکتردا جیاوازە.

بەڵام بۆ چادر و خێوەتەکانیان دەبێت بڵێم کە خێوەتی کوردەکان وەک هی گشت ئاسیاییەکانە و لە قوماشێکی لاکێشەیی موویی فراوان پێک دێت کە لە کاتی بەکارهێنانیدا ڕیزی ناوەڕاستی بە دار و ئامرازی لە شێوەی عەمود بەرز ڕادەگیرێت. بەڵام چەندیەتی فراوانی ئەم خێوەتانە بە پێی چەندیەتی خێزانی ناو خێوەتەکە جیاوازە. خێوەتەکانی گەورەی خێڵەکان لە شێوازی حەسیرەکانن کە گەورەتر و بۆ

چەند بەشێک دابەش کراون.

من خێوەتە ڕەشەکەی (کە لە زمانی کوردیدا تاوڵی پێ دەگوترێـت) سـەرۆکی خێڵی مەنگوڕ واتا باپیرئاغا بۆ نموونە دەهێنمەوە. ئەمـە گـەورەترین و فراوانتـرین خێوەتێکە کە من لە سەفەری خۆمدا لای کۆچەریە کوردەکان بینیومە. درێژایی ئەم خێوەتە زیاتر لە ۱۳ مەترە (شێوەی ۱۵).



شێوەی ۱۵-نموونەی خێوەتێکی ڕەیسی کوردی موکری

دەوری خێوەتەکان ماوە ماوە ئاڵقەیان تیادا دروست کـراوە و ئـەم ئاڵـقانە بـۆ بەستنی خێوەتەکە بە ئەرزەوە کەڵکیان لێوەردەگیرێت. بۆ ئـەوەی کـە گواسـتنەوە و ئاڵوگۆڕ تیایاندا ساکارتر بێت ئەوا خێوەتەکان بۆ چەند بەشێک دابەش کـراون. لـە دەور و پشت و چواردەوری خێوەتەکەدا واتا لەو شوێنانەدا کە گوریسـەکان تێـپەڕ

دەبن دارە تاشراوەکانی لە شێوەی بزمار چەقاون. لە دەوری ئەوانەوە بەردەکان هەڵواسراون تاوەکو باران بەرەو ناوەوەی خێوەتەکە نەچێت و لە شوێنی دوورینەوەکە بەرەو ناو تاوڵەکە ئاوی باران ڕێ نەکات. بەم کارە خێوەتەکە لار و شەق ڕادەگیرێت. ئەو شوێنانە لە خێوەتەکە کە دورواونەتەوە بە پارچەیەکی تر لە قوماش دەشاردرێتەوە و بەم شێوەیە خۆڕاگری ئەم بەشە زیاتر دەبێت.

بەشێک لە ناو خێوەتەکە کە بەشێکی بچووکە بۆ ڕاگرتنی خواردەمەنیەکان تیایدا تەرخان کراوە (C). بەشێکی تر لە خێوەتەکە کە بەشی زۆرینە لە خۆ دەگرێت بۆ دانیشتن و حەوانەوەی خێزان کەڵکی لێوەردەگیرێت و گشت چالاکیەکانیماڵەوە لەم بەشەدا بە ئەنجام دەگەن (B). لە ژوورە گەورەکاندا سۆبا کە ئاور پێیان دەگوترێت دانراون و لە دەرەوەی خێوەتەکە قەدی داری داهێنراو کە بۆ ئاخوڕە کەڵکیان لێوەردەگیرێت و ناوەوەیان دەرهێنراوە بەرچاو دەکەون و لە نزیک ئەوانیش ئەسپی سەرۆک خێڵەکانن کە بە زینەوە بەردەوام حازر و لە نزیک خێوەتەکە بەستراونەتەوە.

لەم ڕووەوە کە خێڵەکان زۆرجار لەگەڵ یەکتردا لە شەڕ و پێکداداندان بۆیە بەردەوام ئەسپەکان بە زین و بە ئامادە کراوی لە بەردەم خێوەتەکاندا بەستراونەتەوە.

لە ناو خێڵەکاندا بە گەیشتنی هەواڵی هاتنی دوژمن [*کە ئێمە(وەرگێڕان) بە چارەڕەشی گەلی کوردی دەزانین کە خێڵی هاوسێ بە دوژمن ناو ببرێت و لە بەکارهێنانی ئەم وشەیە زۆر ناموڕتاحین، بەڵام ناچارین بۆ پاراستنی وەرگێڕانی دێرەکان وەک خۆیان ئەم وشەیە بەکار بهێنین و... هتد*] پیاوانی خێڵ سواری ئەسپەکانیان دەبن و بەرەو دوژمن هێرش دەبەن و لەم کاتەدا ئافرەتان کەلوپەلەکان کۆ دەکەنەوە و سواری مانگاکانیان دەکەن و لە شوێنی تێکهەڵچوون دوور

دەکەونەوە و گەر لە شەڕەکەدا سەرکەون ئەوا جارێکی‌تر بۆ شوێنی خۆیان دەگەڕێنەوە و خێوەتەکانیان بەرز دەکەنەوە. بەڵام گەر شەڕ بۆ دوژمن بێت و دوژمن براوەی شەڕەکە بێت ئەوا کاتێک دوژمن بۆ تالانی کەلوپەلەکان دێت دەبینێت شتومەک و کەلوپەلەکان زۆر دوور کراونەتەوە و دەستیان پێیان ناگات.

کوردی ناوچەی موکریان بە ڕادەیەکی زۆر ئەسپ‌دۆستن و ئەسپیان خۆش دەوێت. هەر چەندە کە بە ڕای من تورکەکان لە بەراورد لەگەڵ کوردەکاندا ئەسپ سواری باشترن، بەڵام کوردەکانیش لەم بوارەدا ئەزموونی باشیان هەیە. ئەم گەلە ئەسپ‌سواری و ڕاوکردنی بە ئەسپیان زۆر حەز لێیە. بەڵام ئەم ڕاوکردنە کە ئێمە لە ئەورووپا بینیومانە لەگەڵ ڕاوی بە ئەسپی کوردەکاندا جیاوازی زۆرە. کوردەکان بە توندی بە دوای نێچیرەکانیاندا ڕادەکەن و لەگەڵ ڕاکردن بەرەو ڕاوەکەیان تیرەکانیان دەهاوێژن. دەکرێت بڵێین کە ئەسپ‌سواری وەها لەگەڵ خوو و ڕەوشتی کۆچەریەکاندا ناوێتە بووە کە ئەوان بێ‌ئەسپ سواری ماوەیەکی دوور ناڕۆن و ساحێبی ئەسپەکان شەوی خۆیان لەگەڵ ئەسپەکانیاندا ڕۆژ دەکەنەوە. ئەم حاڵەتە لای خەڵکانی هەژار بەم شێوە نییە، بەڵام لە بەرامبەردا هەژاران توانایەکی زۆری ڕۆیشتنی بە پێیەکانیان هەیە و ماندوونەناسن. ئەوان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دووریەکی زۆر و داوێنە زۆر هەورازەکان تێپەڕ دەکەن. کوردانی موکریان دوای شاڵاوی داگیرکەری عەرەبی ئەرکەکانی ئیسلامی جێبەجێ دەکەن، بەڵام لە دوو مەزهەبی سەرەکی شیعە و سوننە بۆ مەزهەبی دوایی واتا سوننە نزیکترن و هۆگری ئەم مەزهەبەن و بچووکترین ترسێکیان لە تورکەکان نییە کە بە هۆی چیا بەرزەکانەوە لە یەکتر جیا بوونەتەوە. کوردانی موکریان ڕق و بێزاریەکی زۆریان بەرامبەر بە ئێرانیەکان هەیە کە زۆر جار زەویەکانیان داگیر دەکەن و باج و

سەرانەیەکی زۆریان لێ وەردەگرن. ڕق و بێزاری مەزهەبیش ئەم داخەی کـوردانی موکریانی زیاتر و ئەستوورتر کردووە.

ئەمڕۆ کە موکریان سەربەخۆیی خۆی لە دەسـت داوە و حـاکم و سـەرۆکەکان پیاوی ئێـرانیەکانن[1]، زۆر لـە سـەرۆک عەشـیرەتەکان ئاگـاداری ڕێوڕەسـمەکانی حوسێن و حەسەنن و لانی کەم لە ڕواڵەتدا شیعەشێـوەن. بـەڵام زۆربـەی گونـد و کۆچەریەکان هێشتا سوننەن و مەلا کوردەکان بۆ خوێندنی ئایینی بەرەو عوسـمانی (عێراقی ئەمڕۆ) ڕێدەکەن.

دوا سەرهەڵدان و خۆڕاگری سـوننیەکانی موکریـان ساڵـی ١٨٨٧ بـوو. ئـەم سەرهەڵدانە لە نزیک ڕووباری کەڵوێ لای مەنگوورەکانەوە دەستی پێکرد و گشت کوردستانی هەژاند و میاندواو و بنـاو و گشـت گونـدەکانی لای چـەپ و ڕاسـتی دەریاچەی ورمێ و تا تەورێز لە ناو چوون. بەڵام موکریان بـەم سەرهەڵـدانە ئـەم ئازادیە کەمەش کە بووی لە دەستی دا و بە وەحشیگەری و جینایەتی زۆر لە لایەن ئێرانیەکان وێران کرا. ئەمڕۆکە ئەم ناوچەیە بە برینەکانی ئەم کارەساتەوە دەناڵێنێت و هەست دەکرێت کە زۆر شت لێیان ئەستێندراوە و لە ناو چووە.

---

١ – لە ئۆکتۆبەری ١٨٩٠دا سەیفەدین‌خان حاکمی موکریان لە کاتێکدا کە جێگری سەرۆکی وڵاتی ئێران سەردانی سابڵاخی کردووە، ئەمانەی پێشکەش بە ناوبراو کردوون:
١ ئەسپی سەد تمەنی، ١٥٠ کەللە قەند و ٢٥ کیلۆ چا، ١٦٠ کیلۆ مـۆم، ٨٠ کیلـۆ مـۆمی گـەچی، ١٩٢٠ کیلۆ برنجی گیلانی، ٤٨٠ کیلۆ برنجی ئازەربایجان، ٦٤٠ کیلۆ نان، ٣٢٠ کیلۆ نۆک، ٨٠ کیلۆ خوێ، ١٠ دانە زینی فەرشی، ٢٠ دانە زینی چەرم، ٢٤٠ کیلۆ کا، ٢٠٠٠ جێگا وێنجە، ١٦٠٠ کیلۆ جۆ، و ١٠٠٠ تمەن پووڵی نوقرە (٧ تا ٨ هەزار فرانک دەگرێـتەوە). ئەمانـە جگـە لـە چەنـدین شتومەکی‌تر کە بە گەورەکانی‌تری کۆشک دران.



شێوەی١٦- گوندی ئەمەشیر (سەر بە بانە)

لەگەڵ ئەوەدا کە باوەڕی خەڵکانی ئەم ناوچەیە لە سەر دینی ئیسلام و مەزهەبی سوونەیە، بەڵام داب و نەریتی سەیر و سەمەرە لەم ناوچەیەدا کەم نین و من نموونەی بووک‌هێنانێک لە گوندی ئەمەشیری بانە باس دەکەم کە خۆم لەم بۆنەیەدا لەم گوندە بووم.

بووک لە گوندی هاوسێ تا ئەمڕۆکە لای دایک و باوکی ژیانی بە سەر بردووە. ئەم بووکە لە بەرامبەر بڕێکی کەمی پارەدا کە ٢٠ تمەنە و بەرامبەر بە ٢١٤ تا ٢٤٠ فرانک دەبێت فرۆشراوە [پێدەچێت مەبەستی نووسەر لە فرۆشتنی بووک هەمان حەقە مارەیی ئەو بووکە بێت (وەرگێڕان)].

نزیک بە کاتژمێر پێنجی دوانیوەڕۆ کە کاروبارە مەزهەبییە کە لە گوندی هاوسێ بە ئەنجام گەیشت، بووک سوار لە سەر ئەسپ بەرەو ئەو گوندە بە ڕێ کەوت و ئاژەڵێکی بارکێش لە دوای بووک دەڕۆیشت کە جلوبەرگ و جیهاز و شتومەکی بووک لە سندووقێکی سووردا لە سەری بار کرابوو.

هاوکات لەگەڵ دەرکەوتنی ئەم کاروانە بچووکەدا لای گوندی هاوسێ تەقەی خۆشی لە هەر لایەکەوە بە گوێ دەگات. لە کاتی گەیشتنی بووکدا بە گوند، ناوبراو

بەرەو ماڵی پیاوەکەی ڕێنمایی دەکرێت و ئافرەتانی گوند بە گەرم و گوڕییەوە دەوری دەدەن و لەم بۆنەیەدا ئافرەتان بە تایبەتی و هەندێ لە پیاوان بە دەنگی بەرزەوە لەگەڵ یەکتردا دەدوێن. دواتر بە دەنگی گۆرانی گوتنی پیاو یا خود ئافرەتێک ئامادەبووان دەست لە دەستی یەکتردا لە دەوری ئاگرێک هەڵپەڕکێ دروست دەکەن و شادی و خۆشی دەردەبڕن.



شێوەی١٧- گوندی ئەمەشیر(سەر لە بانە)

شێوازی گۆرانی گوتنەکە ئارام بوو و هەندێ جار پێکەنینێک کە زۆرێک لە جەماعەتی دەگرتەوە ڕواڵەتی هەڵپەڕکێکەی دەگۆڕی. من خوازیاری ئەمە بووم کە وەرگێڕدراوی ئەم گۆرانیانە بە دەست بخەم، بەڵام هیچ کام لە هاوڕێ کوردەکانمدا نەیانتوانی ئەم گۆرانیانە بۆم وەربگێڕن و دەیانگووت کە ئەم گۆرانیانە جگە لە زمانی کوردی ناگوترێن و بە زمانی تر وەرناگێڕدرێن! خۆم لە بەشێکی کەمی ئەم گۆرانیانە گەیشتم کە بە ڕاستی ناتوانرێت ئەم بەشە کەمەش وەربگێڕدرێت!.

لە ئەدەبیاتی موکریاندا چەندین بەسەرهات و چیرۆکی سەرنج ڕاکێش هەیە سادەیی و خۆشباوەڕی خەڵکانی ئەم ناوچەیەی لێوە دەردەکەوێت. من چەند

دانەیەک لەم چیرۆکانەم بە دەست خست، بەڵام خۆم بە ناچار دەزانم کە لێـرەدا بـە چاپیان نەگەیەنم. هەڵپەڕکێی بووک هێنانەکە تا درەنگایەکی شەو درێژەی کێشـا و من ئیعتیراف دەکەم کە نەمتوانی تا کۆتایی ڕێوڕەسمەکە خۆم ڕابگرم و لە ڕاسـتیدا من کۆتاییەکەم نەبینی، چوونکە ڕێوڕەسمەکە نزیک بە خۆرهەڵاتی سەر لە بـەیانی کۆتایی پێهاتبوو و ئەو کـاتە بـووک و زاوا دەسـت لـە دەسـتی یـەکتردا کۆمەڵـی خەڵکیان جێهێشتبوو. گەر بووک هێنان لەم ناوچەیەدا سەیر و سەرنجڕاکێشە ئـەوا دەبێت بڵێم کە ڕێوڕەسمی بـە خـاک سـپاردنی مردوویـەک لـە بـووک هێـنانەکە سەرنجڕاکێشترە. ئەم خەڵکانە تا ڕادەیـەک سـادەیی و سـاکاری چینـەکانی پێـش خۆیانیان پاراستووە. لە کاتی مانەوەی مندا لە گوندی پەسوێ پیاوێک مرد، یا لانی کەم ئاسەواری ژیان تیایدا نەما. لە ماوەیەکی زۆر کەمدا گشـت هاوسێـکان بـەرەو ماڵی ئەو کەسە چوون و پیاوان کەمتر هاوار و گریانیان هەبوو، بـەڵام ئافرەتـان و منداڵان هاواری بێهیوایانەیان بە ئاسمان دەگەیشت! گەر هەژارێک هێشتا گیـانی لە بەردا مابوایە و خەڵکان بەم شێوەیە بۆی گریابایەن ئەوا ئەم کەسـە زۆر زووتـر گیانی دەسپارد! نزیک بە نیو کاتژمێر دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵی کۆچی دوایی ئەم کەسە، پیاوانی گوند نوێژیان لە سەر خوێند و کۆچ کردوویان بەرەو ڕووبار برد تـا دوای جلوبەرگ لە بەر دانانی بە پاکی بیشـۆن. لـەم کاتـەدا ئـەم پیـاوە دەسـت و پێیەکانی جووڵاندن و زیندوو بۆوە، خەڵکان هاواریـان کـرد کـە شـەیتان لـە نـاو جەسـتەیدایە... شوشـتنی کـۆچکردوو بـە کۆتـایی گەیشـت و بـەرەو گۆڕسـتان هەڵیانگرت. گشت خەڵکی گوند ئەم مردووەیان بە گریان و هاوار کردنەوە بـەرەو گۆڕستان هاوڕێیی دەکرد و لەمە دەچوو کە ئەم کەسە لای گشـت خەڵـکی گونـد جێگەی ڕێز بوویێت. دوای داپۆشـرانی گـۆڕی کـۆچکردوو ئافرەتـان لـە دەوری

کۆبوونەوە و گریانەکانیان درێژە پێدا و دواتر بە دوور کەتنەوەیان و بە ڕێ کـەوتن بەرەو گوند و بە هاواری «وەی وەی وەی وەی» کە بە یەکەوە ئافرەتان دەیانگوتەوە ئەم دۆخە درێژەی کێشا. دوای ئەمە کە پیاوان کاریان لەم ڕێوڕەسمەدا تەواو بوو لە دەوری یەکتر کۆ بوونەوە و خەریک بە قلیانکێشـان بـوون و باسـیان لـە ئـیش و کارەکانیان دەکرد. دواتر هاوارەکانی ئافرەتانیش کەمتر بوو و بە کۆتایی گەیشـت و بڵاوە بەم کۆبوونەوەیە کرا. کۆچکردوو جاری یەکەم بە هۆی نەخۆشیەوە چاوەکانی لێک نابوو، بەڵام دواتر بە شێوازێکی سـەیر کـوژرا و کۆتـایی بـە ژیـانی هێـنرا. خەڵکان لە گەڕانەوە بەرەو گوند باسی کۆچکردوویان دەکرد و یەکێک دەیگوت کە ئەمە سەرشۆڕیە بۆ گوندەکەمان کە ئەم پیاوە نەیتوانی لە شەڕدا گیـانی لـە دەسـت بدات و ئەوی‌تر دەیگوت کە ئەم پیاوە هەژار بوو و بـە هـەژاری کـۆچی کـرد و... هتد. ئەم باسکردنەی دوای کۆچکردووش هەر وەک گریان و هاوارەکان بەشێک لە ڕێوڕەسمی بە خاک سپاردنی کۆچکردوو بوون و تا گەیشتنی خەڵک بە گوند ئـەم باسکردنە درێژەی دەکێشێت و هیچ کەس بیر لەم قسە ناکاتەوە کە دەیکات.

نەریتی لە ناو بردنی کەسانێک کە توانایی ناسین و ناسـینەوەی خۆیانیـان لـە دەست داوە لە گشت کوردستان و ئێراندا زۆر و بەرچاوە. هەندێ جار کەسێک کـە دەگوترێت گیانی سپاردووە لە کاتی خستنە ناو گۆڕدا دەست و پێیەکانی لێـدەدات. گەر دەنگێکی لێوە بێت ئەوا هەر کەسێک لە نزیکی بێت هەوڵ دەدات تا خۆی لـێ بڕەنجێنێت، بەڵام هیچ کەس ئەمەی لە بیر ناچێت کە دەبێـت بەردێـکی گـەورە لـە سەر جەستەی دابنرێت![1]

---

١- کوردەکان تا ڕادەیەک لە خەوتنی نەخۆش دەترسن لە کاتی ئەگەری خەوتنی نەخۆشێکدا بـە هەر چەشنێک بتوانن دەنگ دەردەهێنن و بەم کارە دەیانەوێت بەر لـە خـەوتنی نـەخۆش بگـرن چونکە ئەوان خەوتنی نەخۆش بە مەرگ و کۆچی دوایی دەزانن.

گەر بزانرێت کە ئافرەتێک خیانەتی بە پیاوەکەی خۆی کردووە -حاڵەتێک کە لە موکریان و کوردستاندا دەگمەنە- و گەر چوار شاهیدیان بۆ ئەم کارە هەبێت ئەوا هەر دوو ئافرەت و پیاوەکە بەردباران دەکرێن[1] و تا ڕادەیەک بەرد بەرەو ئەم دوو کەسە ئاراستە دەکرێن کە بەرزایەک لە بەرد لە دەوریان دروست دەبێت.

هەڵبەت ئەم دیاردەیە لە کوردستاندا کەم ڕوو دەدات، چونکە بوونی چوار شاهید کە بۆ جێبەجێکردنی ئەم سزایە پێویستە بە ئەنجام گەیاندنی ئەم کارە زەحمەت دەکات.

لە داب و نەریتە کۆنەکانی موکریان بە باشی دەزانم باس لە جێژنی حاکمی درۆیین(میر درۆزن) بکەم. ڕێوڕەسمێک کە لە وەرزی بەهاردا لە سابلاخ بەڕێوە دەچێت. لەم شارەدا خەڵکان حاکمێک بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هەڵدەبژێرن کە حاکم لەم سێ ڕۆژەدا هەر کارێک کە حەزی لێی بێت دەتوانێت ئەنجامی بدات. هاوکات لەگەڵ هەڵبژاردنی حاکمدا، حاکم وەزیر و بەردەستەکانی خۆی هەڵدەبژێرێت و لەگەڵ ئەوەدا کە خەڵکان لێیان کۆ بوونەتەوە حاکمی درۆیین بۆ لە سەر کار لادانی حاکمی پێشوو دەچێت. ئەم ڕێوڕەسمە چەندین جار کێشەی لێکەوتۆتەوە و زۆر جار خەڵکی سابلاخ لەم هەلومەرجەدا حاکمی ڕاستەقینەیان کوشتووە. بۆیە ئێستاکە حاکمی درۆیین بەردەوام چەندین سەرباز و نوێنەرێکی حاکمی ڕاستەقینەی لەگەڵدایە تاوەکو حاکمی درۆیین لە سنووری شۆخی و گاڵتە تێپەڕ نەکات.

---

١- نەریتی بەردباران کردن نەریتێکی نەشیاوە کە لە عیبریەکانەوە سەری هەڵدا. ئەو سەرەنجامە کە هانی و ئابسالون گرفتاری بوون.



شێوەی١٨– جەژنی ئەمیری درۆیین(میر درۆزن) لە ساباڵاغ (وێنە: سەیفەدین‌خانی سەردار).

ئەمیری درۆیین(میر درۆزن) سێ ڕۆژ حوکمڕانی دەکات. لەم سێ ڕۆژەدا ڕیش سپیەتی بۆ سەیر و سەمەرەترین کێشەکان دەکات و گوناهکاران تەمبێ دەکات لێیان دەدات. لەم ڕیش سپیەتیانەدا کە حاکمی درۆیین دەیانکات یەک دینار کە بەرامبەر بە یەک میلیۆن قرانە بە یەک قران حساب دەکرێت. ئەم برە پارەیە دەدەن و خۆش دەیگوزەرێنن. لە ڕاستیدا ئەمە کارنەواڵێکی موکریانە.

لە سەردەمانی پێشووتردا ئەم جەژنە زۆر سەرنجڕاکێشتر بووە و گشت دانیشتوانی ناوچەکە بە کڵاو و نێزەکانیانەوە بۆ ئەم ڕێوڕەسمە دەهاتن، بەڵام ئەمڕۆکە ئەم جەژنە شێوازە ڕەسەنەکەی خۆی لە دەست داوە.

من لەگەڵ دیراسەی مەیدانیمدا بۆ ئەم بۆنەیە، بەڵام نەمتوانی چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئەم بۆنەیە بزانم و بەم شێوەیە وڵامی منیان دەدایەوە کە ئەم ڕێوڕەسمە لە باب و باپیرانمانەوە بە ئێمە گەیشتووە. چۆنیەتی ئەم سەرهەڵدانە هەر چۆنێک بێت هەڵبژاردنی حاکم لەویان سەرنج ڕاکێشترە.[1]

---

١– ژاک دەمۆرگان: ئەمرۆکە سەرمایە و باران و تەرزە دادەبارێت و بایەکی سارد دێت. ئێمە نیو فەرسەخ واتا ٣٣ کیلۆمەترمان تێپەڕ کردووە تا بە گوندێک لە بەرزایی ١٦١٠ مەتری ئاستی

**شار و گوندەکان**

له بارەی سابڵاغەوە دەبێت بڵێم کە ئەم شارە لە کەناری ڕاستی ڕووبارێکی بچووک هەڵکەوتووە کە لقێکی تەتەهوویە. سابڵاغ شارێکی پاک و خاوێن و بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی تری ئێران ڕێکوپێکتر بنیاد نراوە. شاری ناوبراو ٨٠٠ بنەماڵە و ٩٠٠٠ کەس ژمارەی دانیشتوانی هەیە. حاکم و گەورەکانی ناوچەکە لەم شارەدا نیشتەجێن. ئەوان لە لایەن تیمێکی ٢٠٠ کەسیەوە پارێزگاریان لێدەکرێت. لە ڕاستیدا دانیشتوانی گوندەکانی دەور و پشتیش بەشێک لە هەمان تیمن و بە بچووکترین فەرمانی حاکم ١٥٠٠ سوارکاری چالاک و چەکدار لە هەر شوێنێ پێویست بێت ئامادە دەبن. سابڵاغ ناوەندی پۆستە و تێلێگرافی هەیە و قەسرێکی ڕازاوە بۆ حاکم و چەند مزگەوتێکی تیادایە. ئەم شارە لە لای ڕۆژهەڵاتەوە بەو

---

ڕووی دەریا بگەین. لەم گوندەدا دوو ئەرمەنی تەوریزی هەن کە لەگەڵماندا زۆر باشن و بە باشترین شێواز خزمەتمانیان کرد. ئەوان بۆ باشتر ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانیان لە ناوچەکەدا جلوبەرگی کوردی لە بەر دەکەن. هەواڵمان پێگەیشت کە سەرتیپ سەیفودین‌خان حاکمی کوردستانی موکری کۆچی دوایی کردووە کە شای ئێران پلەی سەرتیپی پێبەخشیبوو. ناوبراو تەنیا ٢٩ ساڵ تەمەنی بوو. سەیفودین لە زەمانی منداڵیەوە سێیەزی باوکی لە سەر لاچوو و هەتیو مایەوە. باوکی ناوبراو کە حاکمی ئازەربایجان بوو کاتێک کۆچی دوایی کرد سەیفودین تەنیا ٧ ساڵی بوو. دایکی سەیفودین کە ئەرکداری سەیفودین بوو لە خواردنی ماڵی جێماوی پیاوەکەیدا درێغی نەدەکرد و لە گشت ٨٠٠ گوندی ژێر دەسەڵاتی ئەو حاکمە تەنیا گوندی بۆکان لە ژێر دەسەڵاتیاندا مایەوە. بۆیە لە کاتی سەرهەڵدانی موکریاندا سەیفودین یەکێک لە سەرکردەکانی سەرهەڵدان بە ئەژمار دەهات.

سەیفودین لە ڕووی هۆش و هزرەوە کەم‌وێنە بوو. ناوبراو زمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی بە باشی دەزانی و هەندێ لە زمانەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی دەزانی. لە کاتە چارەنوس‌ساز و گرنگەکاندا بەڕێوەبەرێکی زانا و بوێر بوو. چەندین جار کوردستانی موکریانی گرتەوە و ئارامی کردەوە. کۆچی دوایی ناوبراو خەسارێکی گەورە بۆ حکومەتی ئێران بوو. مـن دواتر لەمە ئاگادار کرام کە سەیفودین لە لایەن ئافرەتەکەیەوە کە کچی ئاغایەکی کوردستانی موکریان بوو ژەهرخوراو کراوە (نووسینەکانی ژاک دمۆرگان لە ٢٠ی نۆڤامبەری ١٨٩٠دا).

پێستانانە دەگات کە مێوەکانی ترێی کەموێنە دەدەن.

زۆرینەی دانیشتوانی سابلاغ کوردن و تەنیا چەند سەد کەسێک لە ئێرانی و تورکی تیادایە.

دووەمین شاری گرنگی ناوچەکە شاری سەردەشتە کە ١٥٠٠ کەس دانیشتوانی هەیە و گشت ئەم دانیشتوانە کوردن. سەد سەربازێکی ئێرانی بۆ پاراستنی حاکم و فەرمانبەران کە هاوکاری حاکم لە دژی کوردەکانن بە شێوەیەکی کاتی لەم شارەدا ماونەتەوە.



شێوەی١٩- دێی سەردەشت، وێنە کراو لە ڕووی وێنەی نووسەرەوە.

بانە کە ناوەندی گەورکەکانی بانەیە تەنیا گوندێکی گەورەیە.[1] جلوبەرگی

---

١- لە کاتی چوونی مندا بۆ بانە حاکمی بانە بە خراپی پێشوازی لە من کرد و فەرمانی دا کە من لە لایەن خەڵکانی بانەوە ڕێتمایی نەکرێم. حاکمی بانە دەترسا کە من ئامار و ژمارەی گوندەکانی ئەم ناوچەیە بە تاران ڕابگەیەنم. حاکم باج و مالیاتی لە بنەماڵەکان و ئەو کەسانە کە بۆ عوسمانی

خەڵکانی ئەم ناوچەیە جوان و ڕێکوپێکە و ئافرەتانی بانە جلوبەرگی ئافرەتانی کوردی عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) دەپۆشن.

بانە گرنگیەتی لە بۆکان و سەردەشت کەمترە. بەڵام سەقز[1] بە پێچەوانەوە شارێکی بچووک، مێژوویی و گرنگە کە لە ڕابردوودا بینای خۆراگری تیادا زۆر بووە. ئەم شارە ٤٠٠٠ کەس دانیشتووی هەیە و جێگرێکی حاکمی سنە فەرمانڕەوایی دەکات.

ناوچەکانی تری موکریان پێویست بە باس کردن ناکەن و گشت ناوچەکانی تر گوندی بچووکن کە هەموویان لە یەکتر دەچن.

لە نزیک ساباڵاغ ئاگردانێک هەیە کە من نەمتوانی بیبینم و تەنیا دەبێت ئەوە بڵێم کە خرابووە. هەروەها لە نزیک دۆڵی ساباڵاغ لە شوێنێ بە ناوی ئیندرقاش گۆڕێکی کۆنی لێیە کە بە باشی پارێزراوە. ئەم گۆڕە لە ناو بەردێکی کلسیدا هەڵکەندراوە کە ١٢ تا ١٥ مەتر بەرزتر لە سەر ڕووی زەویە. لایەکی ئەم بەردە نووسراوی پەهلەوی تیادایە کە بە جەوهەرێکی وەها نووسراوە کە لەناوچوونی زەحمەتە، بەڵام ئەمڕۆکە نووسراوەکان بە باشی دیار نین و لە ڕووی نووسینەوەیان ئەستەمە. ئەمە بەرچاوترینی بیناکانی موکریانە کە لە نزیک ئاسەواری شارێکی

---

(عێراقی ئەمڕۆ) سەفەریان دەکرد و ئەو کەسانە کە سزا دەدران وەردەگرت (نووسینەکانی ژاک دمۆرگان لە ٢٢ی ئۆکتۆبەری ١٨٩٠دا).

١- لە سەقزدا کە ناوەندی گەورەکانی کوردستانی سنەیە، سەد بنەماڵەیەکی کەلیمی تیایدا دەژین. لە ناوەڕاستی ئەم شارەدا لە سەر تەپۆڵکەیەک تورکەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا قەڵایەکیان بنیاد نابوو کە هێشتا ئاسەوارەکانی ماوەتەوە. خەڵکانی ناوچەی سەقز کەسانێکی سادە و شەڕانین. لە کاتی گەیشتنم بە سەقز یەکێک لە دانیشتووانی ئەم ناوچەیە بە سیلاحەکەی هەوڵی کوشتنی منی دا، بەڵام من بە خەوتنم لە سەر زەوی گیانم بە دەربرد و دوای ئەوەی کە هاوڕێکانم ئەو کەسەیان گرت لە لایەن حاکمەوە سزا درا. دانیشتووانی میرزادێ جوێنیان بە ئێمە دا و هەڕەشەیان لێمان کرد، بۆیە ناچار بووین شەو لە چادرگەکەماندا بمێنینەوە (٢٤ی ئۆکتۆبەری ١٨٩٠).

کۆن هەڵکەوتووە.



شێوەی ٢٠-بۆکان، وێنە کراو لە ڕووی وێنەی سەیفەدین خانی سەردارەوە.



شێوەی٢١-بۆکان، وێنە کراو لە ڕووی وێنەی سەیفەدین خانی سەردارەوە.

کەمی بینا و پاشماوە و ئاسەوارەکانیان لە موکریاندا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خەڵکان لەم ناوچەیەدا زیاتر ژیانی کۆچەریان هەبووە و بینایان دروست نەکردوون تا ئاسەوارێکیان بمێنێتەوە. واتا تەنیا لە ڕۆژگاری ئێمەدا و لە چەند ساڵێک لەمەو بەرەوە کوردانی موکریان نیشتەجێ بوون. بەڵام پێدەچێت کوردانی موکریان لە ڕۆژگارانی زۆر کۆنەوە لەم کوێستانانەدا ژیان بە سەر دەبەن.

## کشتوکاڵ، پیشەسازی و بازرگانی:

وەک باسمان لێوەکرد کشتوکاڵی سەرەکی لەم ناوچەیەدا چاندنی گەنم و جۆیە. بەڵام لەگەڵیدا ماش و گەنمەشامی و چەند بەهەمێکی تریش دەچێنرێت. دوو بەرهەم کە بە شێوەیەکی سەرەکی بۆ ناردنە دەرەوە کەڵکیان لێوەردەگیرێت بریتین لە مازوو و خوری. مەڕەکان کە لە موکریاندا لای کۆچەریەکان یاخود نیشتەجێبووەکان ڕادەگیرێن برێکی زۆر خوری بەرهەم دەهێنن. برێکی کەم لەم خوریە بۆ دروستکردنی قوماشە ئەستوور و گەرمەکان لە ناوخۆدا کەڵکی لێوەردەگیرێت. هەروەها لەم خوریە برێکی بۆ دروستکردنی ڕاخەر بە کار دەهێنرێت. بەڵام بەشێکی زۆری بۆ شارەکانی تر دەنێردرێت.



شێوەی ٢٢- تورجان، وێنە کراو لە ڕووی وێنەی سەیفەدین خانی سەردارەوە.

لە بارەی مازوودا هەروەک گوتمان لە سەردەشت و بانە کۆ دەکرێتەوە و بۆ سابڵاغ دەهێنرێت. لە سابڵاغیشەوە بۆ تەورێز و تەنانەت ڕووسیا هەنارده دەکرێت.

ئەسپی موکریـان لـە ڕووی توانـا و هێـزی هەنگاوەکانیانـەوە لـە بەهێـزترین ئەسپەکانی ئێرانن. ئەم ئەسپانە بۆ مووسـڵ و ئازەربایجـان دەنێردرێـن. ڕێـگاکانی موکریان سادە و ساکار و هەندێ جار زۆر مەترسیدارن کە گرنگترینی ئەم ڕێگایانە کە کاروانەکان پیایاندا تێپەڕ دەبن بریتین لە:

سابلاغ بۆ ئازەربایجان لە ڕێگەی میاندواوەوە.

سابلاغ بۆ گەڕووس لە ڕێگەی سەردارئاواوە.

سابلاغ بۆ سەردەشت لە ڕێگەی بانە و گەردەنەی بەناوبانگی کێلەشینەوە.

سابلاغ بۆ شنۆ و ورمێ لە ڕێگەی پەسوێ وە.

لە کاتی تێپەڕبوونماندا لە گەردەنەی کێلەشین بە چەندین کاروان گەیشتین کـە بەرەو سلێمانی دەڕۆیشتن.



شێوەی ٢٣-مزتاوە، وێنە کراو لە ڕووی وێنەی سەیفەدین خانی سەردارەوە.



شێوەی٢٤-قەرە گوێز، وێنە کراو لە ڕووی وێنەی سەیفەدین خانی سەردارەوە.

لە ڕێگەی گەردەنەی کێلەشینەوە بۆ مووسڵ ڕێگا هەیە. هەروەها لە ڕێگەی سەردەشتەوە و بە تێپەڕبوون لە ناوچەی ئالان دەکرێت بەم شارە بگەی. جگە لەم دوو شوێنە بەشەکانی تری چیاکان کە وەک سنوور دیاریکراون تێپەڕ بوون پیایاندا زۆر زەحمەتە.

## بەشی دووەم: کوردستانی سنە[1]

### جوگرافیای سروشتی

من کە وشەی کوردستان لێرەدا بە کار دەهێنم مەبەستم تەنیا ناوچەیەکی بچووک نییە و لە ڕاستیدا ناوچەی نێوان ٣٦ پلەی باکوور و دۆڵی ڕووباری گاوەڕۆ لە باشوور و هێڵە درێژەکانی ٤٦ پلە لە ڕۆژهەڵات و سنووری عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) لە هزری مندایە. ئەم ناوچەیە گەر وەک یەکەیەک سەیر بکەین لە باشووری موکریان هەڵکەوتووە و سیستەمی ئیستراتیگرافی (چۆنیەتی هەڵکەوتەی چینەکانی زەویناسی لە سەر یەکتر) یەکەی بە شێوەیەکە کە لێرەوە سیستەمی ئیستراتیگرافی باشووری ئێرانی لەم جۆرە دەست پێدەکات. بەرزی و نزمیەکان ئاراستەی گشتی باکووری ڕۆژئاوا بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتیان هەیە و دەتوانین بڵێین کە لەگەڵ یەکتردا هاوتەریبن. لە باکوور چیای چلچەمە دوایین پێکهاتەی نارێک و پێکە، ئەمە لە حاڵێکدایە کە چیاکانی گورمیان و دانیقاشان و ئەشکان و قالیسەر و... هتد لەگەڵ یەکتردا هاوتەریبن.

---

١- شوێنی پیادا تێپەڕبوونی وەفدی زانستی فەرەنسا لە کوردستانی سنە:
- ٢٠ی نۆڤامبەری ١٨٩٠، سەردار ئاوا (موکریان).
- ٢٠ و ٢١ی نۆڤامبەری ١٨٩٠، کوچک (موکری).
- ٢١ و ٢٢ی نۆڤامبەری ١٨٩٠، کەمەنتو (سنە).
- ٢٢ و ٢٣ی نۆڤامبەری ١٨٩٠، جونیان (سنە).
- ٢٣ و ٢٤ی نۆڤامبەری ١٨٩٠، کەڵەکان (سنە).
- ٢٤ و ٢٥ی نۆڤامبەری ١٨٩٠، زاغە (سنە).
- ٢٥ و ٢٦ی نۆڤامبەری ١٨٩٠، گەزان (سنە).
- ٢٦ی نۆڤامبەر تا ٥ی دێسامبەری ١٨٩٠، سنە.
- ٥ و ٦ی دێسامبەری ١٨٩٠ کەرگاوە.
- ٦ و ٧ی دێسامبەری ١٨٩٠ چەمۆغڵی.
- ٧ و ٨ی دێسامبەری ١٨٩٠ قوروە.

بەڵام لەودیوی سنوورەوە واتا لە ناوچەکانی نێوان کەرکوک و سلێمانی ئەم دیاردانە سەرنج ڕاکێشترن. بەرزاییەکانی عەلی داخ و قەرە داخ و سەگرمە و ئەزمەڕ ڕێکوپێکیەکی زیاتریان تیادا دیارە. ئەم بەرزاییانە بەرەو باشوور لە کوردستان درێژەیان هەیە و تەنیا لە گەیشتنیان بە دۆڵی ڕووباری دیالە یا سیروان لە یەکتر جیا دەبنەوە.

چیای چل‌چەمە کە تا ئێستاکە چەند جارێک ناومان هێناوە بریتیە لە چیایەک کە سەرەکی‌ترین ڕووبارەکانی باکووری ئێران وەک قزڵوەزان و جەغەتوو لێیەوە سەرچاوە دەگرن. هەروەها چەند لقێکی ڕووباری زێی بچووک لەم بەرزاییانەوە سەرچاوە دەگرن. بە شێوەیەکی گشتی ئەم چیایە ڕۆڵێکی گرنگ لە ناو بەرزاییەکانی کوردستاندا دەگێڕێت. بەشی باشووری‌تری ئەم بەرزاییانە بە بەرزاییەکانی هەورامان دەگات کە جگە لەوەی وەک ناوەندێک دەکرێت سەیریان بکرێت لە هەمان کاتدا ئەم بەرزاییانە حوکمی سنووریشیان هەیە. زنجیرەکانی‌تر هاوتەریبن و جگە لەوەی کە ڕێکوپێکیەک بە سیستەمی تۆڕەکانی ئاوی دەبەخشن گرنگیەکی‌تریان نییە.

من پێشتر بە درێژی باسم لە ڕووباری قزڵوەزان کرد. ئەم ڕووبارە لە بەشەکانی سەروو ژمارەیەکی زۆر لقی ڕووبار وەردەگرێت و یەکێک لە دوو لقە گرنگەکانی کە بۆ ناو ڕووباری قزڵوەزان دەڕژێن ڕووباری لەیلا یا خود لەیلاڕوودە کە لە بەرزاییەکانی پەنجەعەلی (هەڵکەوتوو لە ڕۆژهەڵاتی شاری سنە)ەوە سەرچاوە دەگرێت. ئەم لقە لە دەشتە ڕووبەر فراوانەکان تێپەڕ دەبێت کە بەرزایی ئەم دەشتانە زیاتر لە ٢٠٠٠ مەترە و بە درێژایی ئەم ڕێڕەوە ژمارەیەکی زۆر لق‌وپۆی‌تر بەم لقە ڕووبارە دەگەن. بەم شێوەیە ئەم ڕووبارە کوردستانی سنە جێ دەهێڵێت و بە

گەڕووس دەگات.[1]

گاوەڕۆ یا دیالە ناوە جیاوازەکانی ڕووباری سیروانن کە لە ناوچە جیاوازەکاندا پێی دەدرێن. ئەم ڕووبارە لە بەرزاییەکانی شریشکانی نزیک گەردەنەی ئەسەدئاوا هەڵکەوتوو لە ڕۆژئاوای چیای ئەڵوەند سەرچاوە دەگرێت. ئەم ڕووبارە لە ڕۆژهەڵات بەرەو ڕۆژئاوا دەچێت و بەرزاییەکانی شاهۆ و قالیسەر تێپەڕ دەکات و دواتر بەرەو باشووری ڕۆژئاوا ڕێ دەکات تا لە کۆتاییدا بە ڕووباری دیجلە دەگات.

---

١- ژاک دمۆرگان: ئێمە لە دوای کاروانەکەمان دەگەڕێین کە بە ڕێگایەکی تردا ڕۆیشتوون . لە یەکتر دابڕاوین. بۆ جەژنانەوەی شەومان یارمەتیمان لە کوردانی گوندی جوتیان وەرگرت. شەوێکی زۆر ساردە. داباریني بەفر وەستاوە و سەهۆڵبەندانە. ئێمە لە لایەن ساحێب ماڵەوە بەرەو ژوورێک ڕێنمایی کراین کە گشت ئەندامانی ماڵەوەیان لەو ژوورەدا بوون. لە حاڵێکدا کە سیلاحەکانمان لە ژێر سەرمانەوە بوون دەمانەویست بخەوین هەر چەندە کە خەوتن لە ناو دەنگەدەنگ و قیژەی منداڵەکاندا بۆمان زەحمەت بوو. تا کاتژمێر ٥ی سەر لە بەیانی خەوتین. کاتژمێر ٥ کە خەبەرمان بۆیەوە هێشتا بە ڕادەیەک سەرما بوو کە لە سەر ئەسپەکانمان نەماندەتوانی خۆمان ڕابگرین. دوای کەمێکی تر لە سەر هێڵی دابەشکردنی ئاوی دوو حەوزی دەریاچەی ورمێ و ڕووباری قزڵوەزان بەڕێ کەوتین. کوردێک کە شەو لە ماڵی ئەودا حەوابووینەوە وەک ڕێنوێن لەگەڵماندا بوو. لە گوندەکەی تردا هەواڵمان پێگەیشت کە کاروانەکەمان سەر لە بەیانی هەمان ڕۆژ بەرەو سنە بەڕێ کەوتووە و ئێمە لە بەفرێکی بە بەرزایی یەک مەتردا درێژەمان بە ڕۆیشتنی خۆمان دا تا بە گوندی حوسێن‌ئاوا لە بەرزایی ٢٣٢٠ مەتری ئاستی ڕووی دەریا گەیشتین (نووسینەکانی ٢٣ی ئۆکتۆبەری ١٨٩٠ی ژاک دمۆرگان).



شێوەی ٢٥-گوندی قورروە، وێنە کراو لە ڕووی وێنەی نووسەرەوە.

گاوەڕۆ لە لای ڕاستەوە ڕووباری سنە وەردەگرێت کە ڕووبارێکی بچووکە و گرنگی ئەوتۆی نییە و دواتر ڕووبارەکانی هەورامان و شاهریز بۆ ناو ئەو ڕووبارە واتا گاوەڕۆ دەڕژێن. دواهەمین ڕووبار کە ناومان هێنا لەحوسمانی (عێراقی ئەمرۆ) هەڵکەوتووە. دواتر ڕووباری ناریل لە کەلدە پێی دەگات.

لق وپۆیەکان لە لای چەپەوە زۆر زیاترن، ئەمە جگە لە دوای ئەو خاڵە لە ڕووبارە کە وەک سنوور دیاری کراوە. من تەنیا باس لە ڕووبارەکانی خواروو دەکەم: لەلە، لە شاهۆ سەرچاوە دەگرێت. زمقان لە دالاهوو سەرچاوە دەگرێت و گاوارە و دەرمە تێپەڕ دەکات. چەم زرشک لە نێوان دالاهوو و چیای داروجان سەرچاوە دەگرێت و هۆرین و ئاو ئەڵوەند (ئاو هەڵوان) کە لە زاگرۆسەوە سەرچاوە دەگرن بەشێک لە کرماشانن.

وەک ڕوونە کوردستانی سنە بۆ دوو سرووشتی لە یەک جیا دابەش دەبێت کە بەشی باکووری، بانە بەرزەکانی قزڵوەزان و بەشی باشوور، دۆڵی ڕووباری گاوەڕۆ و لقەکانی لە خۆ دەگرێت. ئەم دوو سرووشتە بە هۆی سیما گشتیەکان و ئاووهەواکەیان بە تەواوی لە یەکتر جیاوازن. بانە بەرزەکان بە شێوەیەکی گشتی ڕووتەنن.

لە نێوان ڕووبارەکانی سەقز و خورخورەدا ژمارەیەک بەرزایی و چیا بە ئاراستەی باشووری ڕۆژئاوا و باکووری ڕۆژهەڵات هەڵکەوتوون و دواهەمین کاریگەریەکانیان لە سەر چیای تەکلتۆ نواندووە. لە بەشی باشووری‌تر و لە ناوچەکانی کۆچیان و قەراتەوەرە بەرزاییەکان بەرەو نەمان چوون و جێگەی خۆیان بە دەشتە فراوان و بەرینەکان داوە کە تا ڕادەیەک شەپۆلاوی و بەرزیەکەیان بە ٢٤٠٠ مەتر دەگات. دواتر بە حەوزی سەرووی قزڵوەزان دەگەین کە بریتیە لە ناوچەیەکی فراوان کە چیای چلچەمە و بەرزاییەکانی سنووری بەشی ڕۆژئاواکەی پێک دەهێنن و لە بەشی باشوور بە بەرزاییەکانی سنە و پەنجە کۆتایی دێت. بەڵام لە بەشی ڕۆژهەڵات واتا بەرەو ناوخۆی ئێران هێڵەکانی دابەش‌کردنی ناو بە هۆی بەرزاییە نادیار و نارێک و پێکەکان دیاری کراون. بەشی زۆری ئەم بانانە لە کوردستانی گەرووسدا هەڵکەوتوون کە باسیان لێوە ناکەین چونکە لە ڕاستیدا سەردانی ئەو شوێنانەم نەکردووە. لە کەناری ڕۆژئاوا زەوی زۆر لە نێوان سنە و سەقز و بانەدا هەیە کە لە ڕووی سیاسیەوە سەربە ناوەندی سنەن.

درژایی ئەم بانە زیاتر لە ٢٠٠ کیلۆمەتر و پانی بان بە ٢٠٠ کیلۆمەتر دەگات. لە ناو ئەم بانەدا چەند بەرزاییەک هەڵکەوتوون کە گرنگی ئەوتۆیان نییە. نموونەی ئەم بەرزاییانە چیای تلوانتۆیە کە دوو لای قزڵوەزان لە یەکتر جیا دەکاتەوە.

کاتێک بەرەو بەشی سەرووی ئەم ڕووبارە ڕێ بکەین ئەوا بەو زەوی و چینە نیشتەنیانە دەگەین کە بەرەو ڕۆژهەڵات لێژاییان وەرگرتووە. ئەم زەویانە لە بەشی ڕۆژئاواوە بە بەرزایی و چیاکانی وەک چلچەمە و دەرەوەن و نۆخان دەگەن کە بەرزترین لووتکەیان بە ٤٠٠٠ مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە دەگات. بە شێوەیەکی گشتی دەوری ئەم زەویانە بەو دۆڵ و خڕانە دراوە کە بە هۆی بڕینی نیشتەنیەکانەوە لە لایەن ئاو بەدی هاتوون. ناوچەکە تا ڕادەیەک ڕەنگ و ڕووی ناوخۆی ئێرانی هەیە.

بەشی باشووری ناوچەی سنە بە پێچەوانەوە بە توندی خەساری پێگەیشتووە. ئەم بەشە باشووریە بە هۆی چیا و بەرزاییەکانەوە لە شێوەی دیوارێک بە کۆتا گەیشتووە و ئاوی ڕووبارەکانیش بە ڕێڕەوە باریک و قووڵەکاندا شوێنی تێپەڕبوون بۆ خۆیان دەکەنەوە. ئەم بەرزاییانە بەرزایی زۆریان هەیە و بە شێوەیەکی چڕ لە نزیک یەکتردا هەڵکەوتوون. داوێنەکان وشک و ڕووتن و لێژایی زۆریان هەیە و هەندێ جار تەنانەت شێوازی ستوونی وەردەگرن، ئەم داوێنانە زۆربەی کات بە بەفر داپۆشراون. تەنیا بەشێکی کەم لە زەویەکانی ئەم ناوچەیە بۆ کشتوکاڵ شیاون و زەویەکانی تر دارستانین و وڵامدەرەوەی چالاکی کشتوکاڵی نابن. ڕێگا و بانەکان لێرەدا لە بەشێکی ساڵدا تێپەڕبوون پیایاندا مومکین نییە.

**ئاووهەوا، ڕووەکی سروشتی و سامانی ئاژەڵ**

ناوچەی سنە لە وەرزی زستاندا زۆر ساردە و لە بەرزایی و بانەکاندا لە مانگی گەڵاڕێزانەوە – واتا مانگی دووەمی وەرزی پاییز– تا کۆتایی مانگی گوڵان – واتا مانگی دووەمی وەرزی بەهار– بەفر زەوی سپی‌پۆش دەکات. لەگەڵ ئەمەشدا

سەرمای ناوچە کوێستانیەکان کەمتر لە ناوچە بانە بەرزەکان سەختی دەنوێنێت. لە دۆڵە تەنگەبەر و باریکەکاندا کە نزمتر لە ئاستی رووی دەریاوە هەڵکەوتوون و روو لە هەتاون مێو و هەندێ جار داری هەنجیر بەرچاو دەکەوێت.

دۆخی هەڵکەوتەی شاری سنە بەم شێوەیە: بایەکانی باکوور و رۆژهەلات و رۆژئاوا ناگرێتەوە و روو لە رۆژهەلات هەڵکەوتووە کە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە ماوەیەکی زۆری رۆژدا گەرمای خۆر وەربگرێت. دۆڵی گاوەرۆش دۆخێکی هەڵکەوتەی تایبەتی هەیە بە جۆرێک کە بە هۆی هەڵکەوتەی رۆژهەلات و رۆژئاوا داوێنەکان لە کاتی دەرکەوتنی خۆرەوە تیشکی خۆر لێیان دەدات. بەلام بەشی هەورامان ئاووهەوایەکی زۆر سارد و سەختی هەیە بە شێوەیەک کە هەندێ جار لە ئاووهەوای پیوەنیجی داوێنەکانی شاهۆ دەچێت.

ئەستووری بەفر هەندێ جار بە دوو مەتر دەگات و لە وەها دۆخێکدا کە بەفر فەرمانڕەوایە پێوەندی نێوان گوندەکان بە تەواوی دەپچڕێت.[1]

---

١- ژاک دمۆرگان: ئێمە ئەمڕۆکە لە بانێک بە بەرزی ٢١٥٠ تا ٢٣٠٠ مەتری ئاستی رووی دەریاوە ڕێگەمان بڕیوە کە تیایدا ئەستووری بەفر بە مەترێک دەگات. تیشکی خۆر و تیشکدانەوەی لە سەر بەفرەکان زۆر ئیزعاجمان دەکات. لە لای ڕۆژهەلاتەوە بانەکە بەرەو قزڵوەزان لێژایی وەردەگرێت. لە ڕۆژئاوا بەرزاییەکانی کوچک بە بەرزی ٣٠٠٠ تا ٤٠٠٠ مەتری هەڵکەوتوون. ئێمە بە کەلاوەکانی گوندی ئەحمەدئاوا گەیشتین. چەند ساڵ لەمەو بەر حاکمی ناوچەکە کە کێشەی لەگەڵ کوردەکاندا هەبووە هەوڵی داوە تا بنەماڵە ئێرانی(عەجەم)یەکان بەرەو ناوچەکە بهێنێت و گوندی بۆیان بنیاد ناوە تا لە بەرژەوەندی خۆیدا کەڵکیان لێوەربگرێت و ناوچەکە بەم شێوەیە بخاتە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە. ئەحمەدئاوا یەکێک لەم گوندانەیە. ئەمڕۆکە ئەم گوندە بەرەبەرە بەرەو چۆڵبوون دەچێت و تەنیا کەلاوەکان ماونەتەوە. ڕۆژانە تەرمی ئەو ئێرانی(عەجەم)یانە لە ناو مەزرا و کێڵگەکاندا دەدوزرێتەوە کە لە لایەن کوردەکانەوە کوژراون. بەرهەمەکانی ئەو کەسانە سووتێنراون و ئاژەڵەکانیان بە تالان چوون. هەندێ لە ئافرەت و کچەکانیان بەرەو کوێستانەکان بردووە. ئەو کەسانەش کە توانیبێتیان بەرەو ناوچەکانی ئێرانی(عەجەمستان) هەڵهاتوونەوە و هەر چی بوویانە بۆ کوردەکان جێیان هێشتووە (نووسینەکانی ٢٥ی نۆڤامبەری ١٨٩٠ی ژاک دمۆرگان).

ئەم ناوچەیە ساحێبی دار و دارستان نییە. تەنیا لە چەند دۆڵێكدا كوردەكان بـە وردی خزمەتی سپیدارەكانیان دەكەن. جگە لەم سپیدارانە لە كاتی سپی پۆش بوونی زەویدا بە هۆی بەفرەوە دار یاخود ڕووەكێكی‌تر بەرچاو ناكەوێت. لـەم كاتـەدا لـە دوورەوە دووكەڵی سووتاندنی پەینی ئاژەڵی بەرچاو دەكەوێت.

دانیشتوانی ناوچەكـە لـە وەرزی كشتوكاڵـدا گـەنم و جـۆ و تـوتن و سـەوزە دەچێنن. ئەوان بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەكانیان كوێستانەكان دەپێون و دوور دەكەونـەوە. بۆ لەوەڕی وەرزی زستانی ئاژەڵەكانیشیان كا و لەوەڕی وشك كراو ڕادەگرن.

ڕاو كردن لەم بانەدا كەمە چونكە لێرەدا حەشارگەی ئەوتۆی لێ نییە و جگە لە گورگ كە دەستە دەستە لە بەرزاییەكانـەوە دادەبـەزن، ئاژەڵـی‌تـری كێـوی بـەدی ناكرێت. بـەڵام لـە ناوچـە كوێسـتانیەكاندا بـە پێـچەوانەوە دارسـتان و ڕووەك و ئاژەڵەكان زۆر و لەم ڕووەوە ناوچە كوێسـتانیەكان لـە موكریـان دەچـن. ژمـارەی دانیشتوان لە ناوچە كوێستانیەكاندا كەمە بۆیە نێچیرەكان بە ئاسـوودەییەوە لـە نـاو دارستانەكان و شـاخەكاندا دەحاوێـنەوە. لـە هـەورامان و بەرزاییـەكانی شـاهۆ و دالاهوودا ژمارەیەكی زۆر ورچ و بەراز ژیان بەسەر دەبەن. هەروەها بزنە كێویەكان دەستە دەستە لە سەر بەرزاییە بەرزەكانـدا، كـە گەیشـتنی مـرۆڤ پێـیان ئەسـتەمە، هاتووچۆ دەكەن. لە بارەی باڵندەكانیشەوە دەبێت بڵێین كە ژمارەی باڵـندەكان لـەم ناوچانەدا زۆرە.



شێوەی٢٦-منداڵانی گوندی قوروە

دانیشتوان کشتوکاڵ دەکەن بەڵام ئەم بەرهەمە کشتوکاڵانە کەمن. نانی دروستکراو لە بەرووی شیرین بنەمای خۆراکی دانیشتووانی ناوچەکەیە. بە تایبەتی لە هەوراماندا زەوی کشتوکاڵی کەمە و دانیشتوان بۆ درێژەدان بە ژیانی خۆیان و ئاژەڵەکانیان خەریک بە دابین کردنی خۆراک لە ڕێگەی سروشتەوەن.

**دانیشتووان**

دانیشتووانی ناوچەی سنە هەر وەک سلێمانی لە عێراقی ئەمڕۆ [کە ئەو کات کورستانی باشوور بەشێک لە عێراقی ئەمڕۆ بووە. (وەرگێران)] گشتیان بە کوردی دێنە ئاخافتن و گشت دانیشتووانی ناوچەکە کوردن. هەندێ لە کۆچەریەکانی تورک و ئێرانی کە لەم ناوچەیەدان بە زمانێکی نزیک لە یەکترەوە قسە دەکەن. واتا لە ڕووی زمانەوە ناوچەی سنەش لە موکریان دەچێت. بەڵام لە ڕاستیدا زمانی ئاخافتنی

کوردی ناوچەی سنە وەک زمانی ناوچەی موکریان و بە تایبەت دۆڵـی ڕووبـاری زێی بچووک پاراو و ڕەسەن نییە. لە زمانی کـوردی سـنەدا زۆر وشـەی ئێـرانی و عەرەبی بە کار دەهێنرێن و گوتاری کوردی ڕەسەن بەو شێوەیە کە لە موکریاندا هەیە لە ناوچەکانی سنە نەپارێزراوە. بەڵام دەبێت ئەوەش بگوترێت کـە لـە ناوچـەکانی دوورەدەست و سەختی وەک بیوەنیج و هەوراماندا کارتێکەری زمانی بێگانە کەمترە و تەنانەت شێوەزاری تایبەت بە خۆیانیان هەیە. ئەم خەڵکانە بێگومان پاشماوەی ئەو خێڵانەن کە لە لایەن سنەییەکانەوە بەرەو ناوچە دوورەدەستەکان ڕەتێنراون.



شێوەی ٢٧- تاتۆی ئافرەتانی کوردی چەمۆغلی.

من لێرەدا باس لە شێوەزاری هەورامی ناکەم، چونکە ئەمە خۆی پێویسـتی بـە شیکردنەوە و بابەتێکی تایبەتی هەیە. بـەڵام ئەمـە ڕوون دەکەمـەوە کـە کـوردانی بیوەنیج بە ئاسانی لە زمانی هەورامی تێدەگەن و پێیان وایـە کـە لەگـەڵ کـوردانی هەوراماندا لە یەک ڕەگن. بەڵام ئـەوان لـە یـەک ڕەگ نـین و دابڕانەکەشـیان بـۆ سەردەمانی زۆر زوو ناگەڕێتەوە و هێشتا ئاسەواری زۆر لەم بارەیەوە ڕاگیراوە.

پۆشینی جلوبەرگی کوردانی ناوچەی سنە لـە جلوبـەرگی کـوردانی ناوچـەی موکریان دەچێت و تەنیا جیاوازیان لە مەندیلەی سەریاندا دەردەکەوێـت. کـوردانی

ناوچەی سنە زۆر بە هێز و ماسوولکەیین. ئافرەتەکانیان دەم و چـاو ڕێـک و زۆر جوانن و حیجاب ڕاگرتن نییە. جلوبەرگەکانیان چەند پارچە قوماشێـکی کۆنـەن و بە پێی بێ پێڵاوەوە بە سەر بەفردا ڕێ دەکەن و سەرما کاریان تێناکات. ئافرەتەکانیان زۆر جار تاتۆ دەکەن و ئەم تاتۆیە لە سەر دەستەکانیان و دەم و چاو و هەندێ جار لە سەر گشت جەستەیان دەبێت. پیاوەکانیان زۆر کەم (ئەویش لەسەر باڵیان) تـاتۆ ئەکەن. واتا دەکرێت بڵێین کە پیاوەکانیان تاتۆ ناکەن.



شێوەی٢٨- تاتۆی ئافرەتانی کوردی کەڵەکان.

**شار و گوندەکان**

ناوچەی سنە تەنیا هەڵگری یەک شارە کە شارێکی گرنگە و بە سنە یا سەنەندەج ناسراوە. ئەم شارە وەک باسمان لێوە کرد لە داوێندا هەڵکەوتووە. ئەم شارە نزیک بە سی هەزار کەس دانیشتوانی کورد و ئێرانی و جوولەکەی هەیە. سنە شوێنی حەوانەوەی حاکمی ناوچەکەیە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەرکی ئەم حاکمە زۆر گرنگ نییە. دانیشتووان و کۆچەریەکانی دەور و پشتی سنە و تەنانەت ناو و شاری سنە لە سادەیی و ساکاریدا ژیان بە سەر دەبەن و لە مرۆڤە سەرەتاییەکان دەچن بۆیە بەردەوام کێشە و سەرهەڵدان تیایدا بەدی دەکرێت. حاکم تەنیا لە ڕێگەی زەبر و زەنگەوە باج و ماڵیاتەکان وەردەگرێت و زۆر جار ڕووی داوە کە دانیشتووانی سنە حاکمیان لە شار بەدەر کردووە. نموونەی ئەو ڕووداوە زۆرە. لە سنە حوکمڕانی سەخت و ئەستەمە. جگە لەمەش کوردانی سنە لە میوان و بە تایبەت لە بێگانە و مەسیحیەکان خۆشیان نایەت. لەگەڵ ئەوەدا کە من هەڵگری چەند حوکم و هاوڕێ لەگەڵ ئەفسەرێکی پایەبڵندی ئێرانیدا بووم، بەڵام بە بەرد پێشوازیان لە ئێمە کرد. دوای ماوەیەکی کەمی مانەوەمان لە سنەدا کاتێک ئەم شارەمان جێهێشت دووبارە خەڵکان بە بەرد و زیڵ پێدادان ئێمەیان بەڕێ دەکرد.



شێوەی٢٩– تاتۆی ئافرەتانی کوردی کەڵەکان و کەلهوڕ.

گوندەکانی کوردستان بە هەڵکەوتنیان لە یەکە کوێستانیەکاندا یا خود بە بوونیان لە بانە بەرزەکاندا تایبەتمەندی جیاوازیان هەیە. لە ناوچە دوورەدەستەکان و لە ناو قووڵایی دارستانەکاندا بە گەڵا و لق و پۆی دارەکان خانووەکان دروست دەکرێن کە بە گڵ و قوڕ دادەپۆشرێن، بەڵام لە دەشتە بێدارەکاندا کە دار و تەختە نرخی زۆر زیاتری هەیە بە خشت خانووەکانیان بنیاد دەنێن. لەم گوندانەدا بۆ ئەوەی کە لە وەرزی زستاندا خاڵکان بێ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بەفر و سەرمادا بتوانن بە یەک بگەن زۆربەی خانووەکانیان لەگەڵ یەکتردا پێوەندیان هەیە. لەم گوندانەدا زۆر جار بۆ گەرمیدان و خۆ گەرمکردنەوە کەڵک لە سووتاندنی پاشماوەی ئاژەڵی وەردەگیرێت و خەڵکان لە دەوری ئاگرەکەدا کۆ دەبنەوە. زۆر جار گوندەکان لە نزیک جۆگاکانی ئاو و دۆڵەکاندا هەڵکەوتوون. لەم حاڵەتانەدا تەویلە و ئاغەڵەکان بۆ ئاژەڵەکان زەویان بۆ هەڵدەکەندرێت. لە سەرەتای زستانەوە ئاژەڵەکان لە ناو تەویلەکاندا دەمێننەوە و تا بەهار بۆ دەرەوە ڕێگایان پێنادرێت. شوێن بۆ هەواگۆڕکێ لە تەویلە و خانووەکاندا لە بەرچاو گیراوە. بە شێوەیەکی گشتی بۆ ماوەی چوار تا پێنج مانگ دانیشتووانێک کە ژمارەیان بە ٤٠٠ تا ٥٠٠ کەس دەگات، لەگەڵ ئاژەڵ و باڵندەکانیاندا لە ڕووبەرێکی نزیک بە نیو هێکتاردا ژیان بە سەر دەبەن. لەم ماوەیەدا کەس بەرەو دەرەوەی گوند ڕێ ناکات و لە بەفرەکاندا ژیانی خۆی لە مەترسی ناوێژێت و پشت بەست بە خۆراکە عەمبارکراوەکانیان دەژێن. نافرەتان لەم ماوەیەدا ڕاخەر و قوماش دروست دەکەن و پیاوان خەریک بە دووریني گۆرەوی و ئاگاداری ئاژەڵەکانیانن. هەندێ لە ڕۆژان ئاژەڵ و ئەسپەکان بۆ ئاوپێدان بۆ نزیک ڕووبار بەدەر دەکرێن.



شێوەی ٣٠- شێوازی تۆپۆگرافیکی گوندی کەرگاوا.

گەر ساڵێک وەرزی زستان درێژتر بێت، واتا زیاتر بخایەنێت و یا گەر خۆراکە عەمبارکراوەکان بە هەر هۆیەکەوە تووشی خرابوون بێن، ئەوا دەگوترێت قاتی و قڕی هاتووە. لە وەها دۆخێکدا کە مەبەستمان لە کۆمەڵگایەکی نیشتەجێبوونی بچووکە کە لەگەڵ ناوچەکانی تری جیهاندا پێوەندیەکیان نییە و لە ژێر بەفرەکاندا ماونەتەوە دڵتەزێنترین ڕووداو و کارەسات دەکرێت بەدی بێت. ئاژەڵە مردووەکان لەم بارودۆخەدا دەخورێن و دوای تەواوبوونی ئاژەڵەکان

مرۆڤەکانیش بەرەو ئەمان دەچن. لەم چەشنە دۆخەدا کێبڕکێی خۆدەربازکردن و ڕاکردن لە مەرگ بە مانای ڕاستەقینە لە ناو کوردەکاندا بەرچاو دەکەوێت. هەندێ کەس بەرەو ناو بەفرەکان دەچن و هەوڵی دەربازبوون دەدەن و هەندێ کەس پارێزگاری لە عەمبارەکانی خۆیان دەکەن. هەندێ جار سەری یەکتر دەبڕن تا وەکوو بوونەکانیان لە ناو خۆیاندا دابەش بکەن! لێدەگەڕێن تا منداڵەکان و ئافرەتەکەی لە نەبوونیدا بە هیلاک بچن!



شێوەی ۳۱-نموونەی نیوەڕو (پرۆفیل)ی گوندی دەور و پشتی سنە

بە خۆشیەوە ئەو گوندانە کە دوورەدەست و بە تەنیان، کەمن. زۆرینەی گوندەکان بە شێوەیەک هەڵکەوتوون کە هەشت تا دە گوند لە پەنای یەکترن و بەم شێوەیە بە ئاسانی‌تر بەربەرەکانی لەگەڵ قاتی و قڕیدا دەکرێت. بەڵام گوندی وەهاش هەیە کە تەنیا لە یەک وەرزە زستانێدا نۆ لە سەر دەی دانیشتوانەکەی بە هۆی ئەم قاتی و قڕیەوە لە دەست داوە.




شێوەی٣٢-نەخشەی خانووی کوردێک لە گوندی مەراغە

کەمی دار و تەختە لە بان و ناوچە نا دارستانیەکاندا بە ڕادەیـەک دەگـات کـە گشت شوێنەکانی حەوانەوەی مرۆڤ و ئاژەڵی عەمبارەکانی ڕاگرتنی شـتومەک لـە گڵ و قوڕ دروست دەکرێت. ئەم عەمبارانە بریتین لە سندووقێکی گەورە کە لە گڵی ڕۆس (ئەرژیل) دروست دەکرێت و سوار لە سەر چـوار تایەیـە. درەگایـەک لـەم سندووقانەدا دادەنرێت. گەورەیی و بچووکی ئەم سندووقانە بە پێـی بەکارهێـنانیان دەگۆڕێت. لەو ماڵانەدا کە بوونی زیاتریان هەیە ژمارەیەک لەم سـندوقانە بـەرچاو دەکەوێت. لە شوێنەکانی تری وەک سـوودان و... هتـد کـە تەختـە و دار کەمـە بـۆ دروست کردنی سندوقی لەم شێوە، کەڵک لە ئارژیل (خاکی روس) وەردەگیرێت.



شێوەی ٣٣-نیوەڕو(پڕۆفیل)ی خانوویێک لە گوندی مەراغە


شێوەی ٣٤- دزلاوی گلی، بەکارهاتوو لە کوردستانی سنە

**کشتوکاڵ، بازرگانی و پیشەسازی**

کوردەکانی سنە وەک باسمان کرد گەنم و جۆ و سەوزە دەچێنن. بەڵام زۆرێک لەم بەرهەمانە لە شوێنی خۆی بەکار دەهێنرێت، واتا بـۆ دەرەوە نانێردرێـت. جگـە لەمانە لە سنە و دەوروپشتی ڕاخەری زۆر باش دروست دەکرێن و قوماشی نموونە بەرهەم دەهێنرێت.

سنە لە ڕووی دروست کردنی ڕاخەرەوە لە گشت ئێراندا بە گرنگتـرین ناوەنـد

ناسراوە. کەوا بوو ئەم شارە بازرگانی سەرنج ڕاکێشی تیادایە. بەڵام تا ئەمڕۆ کەسێک لە ئەورووپاوە بۆ ڕێکخستنی دروست کردنی ڕاخەر بۆ سنە نەهاتووە. واتا خەڵکان لەم بارەوە بە ڕێگا کۆنەکانیانەوە وێڵ کراون. بۆیە ڕاخەری سنە بە ڕەسەنتر دەناسرێن. چونکە لە شوێنەکانی تر ناوەندەکانی ئینگلیزی کاروبارەکانیان ڕێک دەخەن و ڕەنگ و تەرحیان بۆ ئامادە دەکەن.

جگە لەمە مازوو لە دەوروپشتی هەورامانەوە کۆ دەکرێتەوە و تا ڕادەیەک بازرگانی پێوە دەکرێت. میوە و دانەوێڵە بۆ بازرگانی نییە و تەنیا بەشی ناوچەکەیە.

## بەشی سێیەم: کوردستانی کرماشان[1]

١- شوێنی پیادا تێپەڕبوونی وەفدی زانستی فەڕەنسا بە کوردستانی کرماشاندا:

- ٨ی، ژانویەی، ١٨٩٢، دینەوەر
- ١١ و ١٢ی، ژانویەی ١٨٩٢ بێستون
- ١٢ی ژانویە تا ١٨ی فێوریەی ١٨٩١ کرماشان و دەور و پشتی تاق وەسان
- ١٨ و ١٩ی فێوریەی ١٨٩١ کمیەنی کەو
- ١٩ و ٢٠ی فێوریەی ١٨٩١ مایدەشت
- ٢٠ و ٢١ی فێوریەی ١٨٩١ ئارۆن ئاوا
- ٢١ و ٢٢ی فێوریەی ١٨٩١ کرێن(کرند)
- ٢٣ و ٢٤ی فێوریەی ١٨٩١ سۆیەرێزە
- ٢٤ی فێوریە تا مارسی ١٨٩١ سەرپێڵ و دەور و پشتی
- ٢ تا ٤ی مارسی ١٨٩١ ڕجەو
- ٤ و ٥ ی مارسی ١٨٩١ زەهاو
- ٥ تا ١٠ ی مارسی ١٨٩١ هۆرین شێخخان
- ١٠ و ١١ی مارسی ١٨٩١ گواوڕ
- ١١ تا ١٨ی مارسی ١٨٩١ قەسری‌شیرین
- ١٨ و ١٩ی مارسی ١٨٩١ گواوڕ
- ١٩ تا ٢١ی مارسی ١٨٩١کۆشکی شیرین
- ٢١ تا ٢٦ی مارسی ١٨٩١ حەوش کوری
- ٢٦ و ٢٧ی مارسی ١٨٩١ گواوڕ
- ٢٧ تا ٣٠ی مارسی ١٨٩١ قەسری‌شیرین (باخ‌شا)
- ٣٠ و ٣١ی مارسی ١٨٩١ گیەلان
- ٣١ی مارس و ١ی ئاپریلی ١٨٩١ کفراوڕ
- ١ تا ٣ی ئاپریلی ١٨٩١ کەڵکوش
- ٣ و ٤ی ئاپریلی١٨٩١ ئارۆن ئاوا
- ٤ و ٥ی ئاپریلی ١٨٩١ مایدەشت
- ٥ تا ١٠ ئاپریلی ١٨٩١ کرماشان
- ١٠ تا ١٦ی ئاپریلی ١٨٩١ تاق وەسان
- ١٦ و ١٧ی ئاپریلی ١٨٩١ ئالیاوا
- ١٧ و ١٨ی ئاپریلی ١٨٩١ دینوو
- ١٨ تا ٢٠ی ئاپریلی ١٨٩١ گەڕاو ٢٠ و ٢١ی ئاپریلی ١٨٩١ گوڵەجاڕ
- ٢١ و ٢٢ی ئاپریلی ١٨٩١ سەراو (مایدەشت)

**جوگرافیای سروشتی**

جوگرافیای سروشتی ناوچەی کوردستانی کرماشان لەگەڵ پێکهاتەی نەتەوەیی و تایبەتمەندیە ئانترۆپۆگرافیەکانی ناوچەکەدا هاوسنوور و هاوئاهەنگ نیە. بۆیە من لێرەدا ئەمە لە بەرچاو ناگرم و هەوڵ دەدەم تا لە ژێر ناونیشانی کوردستانی کرماشاندا ناوچەکانی کە وەک باشووری‌ترین ناوچەی کوردنشینن دەناسرێن، لەم بابەتەدا شیکردنەوەیان بۆ بکەم.

من ئەم ناوچەیە (کوردستانی کرماشان) لە باکوورەوە تا زنجیرەی چیای نێوان دوو حەوزی ڕووباری دیالە و ڕووباری کەرخە یا گاماسیاو دەزانم. لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرزاییەکانی کەنگەڤەر و کەناری ڕاستی ڕووباری گاماسیاو، لە باشوورەوە بەرزاییەکانی کە پشتکۆ لە زەویەکانی کەلهۆر جیا دەکەنەوە و لە ڕۆژئاوا دەشتی بین‌النهرین.

ئەم ناوچەیە کە بەم شێوەیەی سەروو جیامان کردەوە و چوارچێوەیەکمان بۆ دیاری کرد بە شێوەیەکی گشتی بۆ دوو سروشت و یەکەی تەواو لە یەکتر جیاواز دابەش دەبێت. یەکەی کوێستانی کە تایبەتمەندی کوێستانی بە مانای وشە لە سەری دیارە و یەکەی دەشت و زەویە هەموارەکان کە سروشتێکی تەواو جیاواز لە یەکەی کوێستانی هەیە. لەم یەکەی دواییدا کوردەکان لەگەڵ عەرەبە کۆچەریەکاندا پێوەندیان دەبە.

---

- ٢٢ و ٢٣ی ئاپریلی١٨٩١ تۆنەڕوود
- ٢٣ و ٢٤ی ئاپریلی ١٨٩١ تەنگ‌تیر
- ٢٤ و ٢٥ی ئاپریلی ١٨٩١ پیازئاوا
- ٢٥ و ٢٦ی ئاپریلی ١٨٩١ هەلێران
- ٢٦ی ئاپریل تا ١ی مەی ١٨٩١ باڵەومن (باڵەن)
- ١ و ٢ی مەی ١٨٩١ پشتکۆ.

له باسەکانی پێشووترماندا ڕوونمان کردەوه که لـه کوێستانەکانی کوردستانی موکریاندا چینەکان به هۆی هەڵکەوتەیان لەگەڵ چیاکاندا بۆ دیراسه و شـیکردنەوه ئاڵۆز و ناڕوونن. هەروەها ئەمەشمان خسته ڕوو که چینەکان له کوردستانی سـنەدا دیار و ڕوون و بەرچاون. له کوردستانی کرماشانیشدا به هەمان شێوەی کوردسـتانی سنه چینەکان ڕوون و دیارن. ئاراستەی گشتی چـین و بەرزاییـەکان لـه بـاکووری ڕۆژئاوا بۆ باشووری ڕۆژهەڵاته. بەرزاییەکان له شێوەی دیواره هاتەرییەکان گشت کوردستان و باشووری ڕۆژئاوای ئێران و باشووری ئێرانیان داپۆشیوه.

به سەیر کردنێکی گشتی ئاراستەی باکووری ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژئـاوا که شێوەی ستوونی له سەر ئاراستەی بەرزاییەکانه ئەوا یەکەم چەمانەوەی گەوره که پێی دەگەین چەمانەوەی دالاخانی (چیـای دێ‌چشـمه)یـه. دواتـر چەنـد زنجیـره چیایەکی هاوتەریب لەگەڵ یەکتردا. چیای پەڕاو که به هۆی هەڵکەوتەی بێستوون تیایدا بەناوبانگه. چیای هۆلانه که له باشوورەوه بـه چیـای سـفێ کـوو دەگـات و چیای گڵه کوو پەرسوور(پەڕقرمز) که تا چیای بزانی درێـژه دەکێشێـت، چیاکـانی شرک و دالاهوو و بالۆل که دوو چیای دوایـی لـه ڕابـردوودا لەگـەڵ یـەکتردا بـه زاگراس ناسرابوون، دواتر چیاکانی کەلهوڕ و نواکوو و سەمبوله و ئەنارەک و شاکێو که نزیک سنووری عێراقی ئەمڕۆیه.



شێوەی ٣٥-میرپێنج حسام‌الملک حاکمی کرماشان و کورەکەی.

چیای دالاهوو بەرزتر له گشت چیاکانی‌تره و لووتکەی ئەم چیایە بەردەوام بە بەفر داپۆشراوە کە لە دوورەوە بەرچاو دەکەوێت. ئەم چیایە بە ڕووی بین‌النهریندا دەڕوانێت و له سەردەمانی زووە ناوبانگی هەبووە. لەگەڵ ئەوەدا کە ئاراستەی گشتی ئەم بەرزایی و چیایانە ڕێکوپێکە، بەڵام لە ڕووی بەرزی و بەرزاییەکەیانەوە هاوشێوە و یەکسان نین. واتا دەکرێت بڵێین کە چینەکان زەخت و پاڵەپەستۆیەکی ڕێکوپێکیان بە سەر هاتووە، بەڵام چەندیەتی زەخت و پاڵەپەستۆیەکە نایەکسان بووە و لە ئەنجامی ئەمەوە بەرزاییەکان بە بەرزی نایەکسانەوە بەدی هاتوون و لە ناو

ئەم بەرزاییانەدا دۆڵی قووڵ و هەندێ جار بە پیت بەدی هاتوون. ئەم دۆڵ و دەشتانە ڕێکوپێکیەکی سەرنج‌ڕاکێشیان هەیە و ژمارەیەکی زۆر گوندیان لە باوەش گرتوون. ئەم دۆڵ و دەشتانە خەڵکانی نیشتەجێ‌بوویان لە خۆ گرتوون و لە کوێستانەکانیشدا کۆچەریەکان ژیان بە سەر دەبەن. گرنگترینی ئەم شوێنانە لە لایەن ڕووبارەکانی وەک گاماسیاو و قەرەسووەوە تێرئاو دەکرێن. بەڵام ناوچەکانی‌تر تەنیا ساحێبی ڕووبارە بچووکەکانن. لە هەندێ شوێن تەنیا لە ڕێگەی ژێر زەویەوە ئاوی پێویست دابین دەکرێت و بە تایبەت لای کۆچەریەکان کە بەم شێوەیە خەڵکان ناچار بە هەڵکەندنی بیری ئاون.



شێوەی ٣٦– کورەکانی حاکمی کرماشان.

ڕووباری گاماسیاو کاتێک دەشتی ئەسەدئاوا و نەهاوەندی هەڵکەوتوو لە بەرزاییەکانی کەنگەڤەر تێپەڕ دەکات ڕووبارێکی مەزن و گەورەیە. دواتر بە تێپەڕبوون لە دۆڵە قووڵ و لاوەکیەکانی دالاخانیدا بە داوێنی شاخی بێستوون دەگات. دواتر ڕووباری دینەوەر کە لە باکوورەوە دێت و ئاراستەی باشووری هەیە تێکەڵ بەم ڕووبارە دەبێت. بە شوێنکەوتنی زیاتری ڕووباری گاماسیاو دەبینین کە ئەم ڕووبارە دواتر ڕووباری قەرەسوو تێکەڵ بە خۆی دەکات. ڕووباری قەرەسوو ڕووبارێکی پڕئاوی گرنگە کە لە کرماشان و مایدەشتەوە سەرچاوە دەگرێت و وەک باسمان کرد تێکەڵ بە گاماسیاو دەبێت. تێکەڵەی دوو ڕووباری ناوبراو بە تەنگ گوولەدا تێپەڕ دەبێت، تەنگەیەک کە لە ڕووی جوانی سروشتەکەیەوە دەکرێت بڵێین لە ئێراندا بێوێنەیە.[1]

---

١- ژاک دمۆرگان: لە ڕابردووشدا ڕێگای سەرەکی نێوان ئێران و بین‌النهرین هەمان ڕێگا بووە کە خانەقین و قەسری‌شیرین و سەرپێڵ و ئارۆن ئاوا و مایدەشت و کرماشان و بێستوون و کەنگاوەری تێپەڕ کردووە. لە خانەقینەوە ڕێگایەک هەیە کە دەکرێت بە هۆیەوە بە دۆڵی گاماسیاو بگەی، بەلام لە ڕۆژگاری ئێمەدا هاتوچۆ پیایدا نییە، چونکە ڕێگایەکی سەختە و تێپەڕبوون پیایدا ئەستەمە. تەنیا ئەمە دەمێنێتەوە کە ئایا لە نێوان ئیلام و ئێراندا بە ڕێگەی ڕێڕەوی گاماسیاوەوە شوێنی هاتوچۆبوونی هەیە یاخود نا؟ من بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم پرسیارە شوێنکەوتووی ڕێڕەوی ناوبراو بووم و بە تێپەڕکردنی بێستوون بەرەو باشوور بە چیاکانی کە بەرزی زیاتریان هەیە دەگەین. لە گوندی گەڕەبان کە ئێمە لەم گوندەدا ماینەوە ئێمەیان دڵنیا کردەوە کە تەنانەت کوێرە ڕێگاکانیش ئەم چیا و کوێستانانە تێپەڕ ناکەن. بەلام من تا خۆم نەمبینی دڵنیا نەبووم. ڕووبار لە باشووری گوندی گەڕەبان یەکەم چیای ناوی گەرم دەبڕێت و دواتر ڕووباری گزەروو تێکەڵ بە خۆی دەکات کە ڕووباری ناوبراو لە دەشتی خاوە و دۆڵی گەورەی لوڕستانەوە سەرچاوە دەگرێت. لەم دەور و پشتە ڕووبار بە دۆڵی وەها قووڵ و تەنگەبەردا تێپەڕ دەبێت کە تەنانەت ڕێگەیەک بۆ تێپەڕبوونی ئاژەڵی وەک بزن پیایدا نییە. ڕووبار لەم بەشەدا بە خێراییەکی زۆر و لە شێوازی تاڤگەدا ڕێڕەوی خۆی دەبڕێت و بۆیە تەنانەت بە بەلەم تێپەڕبوونی مومکین نییە. پیاوێکی خەڵکی ناوچەکە پێی ڕاگەیاندم کە لەم شوێنە تێپەڕ بووە بە شێوەیەک کە خواردنی پێنج شەو و ڕۆژی لەگەڵ خۆیدا بردووە و لەم ماوەیەدا بە چەنگ لێدان و پێهەڵڕوسکان شوێن ڕێڕەوی ڕووبارەکە کەوتووە. بە وتەی ئەم پیاوە لەم ماوەیەدا نزیک بووە کە ورچ و گورگ و ئاژەڵە

لە تەنگ گوولەوە تا بەرزاییەکانی شێروان ڕووباری گاماسیاو بە جوانترین و ڕازاوەترین سروشتدا تێپەڕ دەبێت. ڕووباری ئاوبراو لە سەر کەڤرە مەڕمەڕەکاندا درزی قوولی بەدی هێناون. لق‌وپۆی زۆر ئاوی خۆیان تێکەڵ بەم ڕووبارە دەکەن کە نموونەی ئەوان بریتین لە: تووەروو[1]، هەڵێران ڕۆ و بێڵەوار و ئاوی کرند (کرێن) و ئاوەکانی کە لە شێوەی تاڤگەدا لە بەرزاییەکاندا دەرژێنە خوارەوە. ڕووباری گاماسیاو لە بەرزاییەکانی شێروانەوە بە ناوی سەیمرە بەرەو ناو خاکی لوڕستان دەچێت و بە شێوەیەک ڕووباری ئاوبراو حوکمی سنووری نێوان ناوچەکانی پشتکۆ لەگەڵ دەسەڵاتی خورەم‌ئاوای هەیە. یەکەم لقی کەناری ڕاستی ڕووباری گاماسیاو لە خوارووی کەنگەڤەر ڕووباری دینەوەرە کە ڕووبارێکی بچووکە و لە بەرزاییەکانی شریش‌خان و داڵاخانیەوە سەرچاوە دەگرێت. ڕووباری دینەوەر ئەم

کێویەکانی‌تر ژیان لەم مرۆڤە بستێننەوە. دواتر بە تێپەڕبوونی لەم بەشە لە لای ڕاستەوە بە کوێرە ڕێگەیەک دەکات کە توانیویەتی خۆی لەم ڕێگەوە بەو لای ئەو تەنگەبەرە بێ ڕێگەیە بگەیەنێت. لووتکەی چیاکان بەفریان تیادایە و داوێنەکان ساحێبی لەوەڕگاکان. بەڵام ناتوانرێت کەڵک لەم لەوەڕگایانە وەربگیرێت. هەندێ جار ڕاوچییەکان ژیانی خۆیان لە مەترسی داوێن و بە مەبەستی ڕاو دەردەکەون. خەڵکانی ناوچەکە ترسیان لەو گورگ و ورچانە هەیە کە لەم کوێستانانەدا ژیان بە سەر دەبەن (نووسینەکانی ۱۹ی ئاپریلی ۱۸۹۰ی ژاک دمۆرگان).

١- ژاک دمۆرگان: ئێمە لە دەشتی مایدەشتەوە بە بەرزی ۱۹۱۰ مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە بۆ دۆڵی ڕووباری گاماسیاو بە بەرزی ۱۳۷۰ مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە لە ڕێگەی دۆڵی ئاونیلانەوە دادەبەزین. ئەم ناوچەیە دانیشتووانی تیادا نییە و تا ڕادەیەک دارستانییە. سروشتی دارەکانی ئەم دارستانانە بە جۆرێکە کە دارەکان بەرزی زۆریان نییە، جگە لە بەشە شێدارەکاندا کە لەو شوێنانەدا کۆمەڵەی دار چنارەکان دیمەنێکی زۆر جوان دەنوێنن. لە هەندێ شوێندا بە هۆی توانەوەی بەفرەکان ئاوی زۆر لەم کوێستانانەدا هەیە و لە هەندێ بەشدا دارەکان لە ڕەگەوە هەڵکەندراون بۆیە لەم دۆخەدا زەحمەتی زۆرمان بۆ کردنەوەی ڕێگا بەر کەوتووە. وەک پێشتر گوتمان لەم دۆڵەدا دانیشتووانی تیادا نییە، بەڵام من زیارەتگایەکم بینی کە لە ڕووی ئەم کەلوپەلانە کە لێیەتی دەردەکەوێت کە زیارەتگایەکی گرنگی ناوچەکە بووە. من هەندێ لەم شتومەکانە کۆ دەکەمەوە. ڕێگاکەمان بە ڕادەیەک سەختە کە زۆر جار ناچارین بە زۆر ڕێگە بۆ خۆمان بکەینەوە. بەم شێوەیە لە کەناری ڕووباری تۆنەڕوود خێوەت هەڵدەدەین و بۆ حەسانەوەمان لێرەدا دەمێنینەوە (نووسینەکانی ۲۲ی ئاپریلی۱۸۹۰ی ژاک دمۆرگان ).

زەویانە بەراو دەکات کە پێشووتر شاری دینەوەری تیادا هەڵکەوتبوو.



شێوەی ٣٧- دۆڵی دینەوەر.

ڕووباری ناوبراو دوای تێپەڕکردنی دۆڵە تەنگەبەرەکان، بەرزایی کلسی پەڕاو لە کەناری ڕاستی خۆی جێ دەهێڵێت. لە بەشی خوارووتر دەشتی کرماشان هەڵکەوتووە کە لەگەڵ دەشتی مایدەشتدا پێوەندی هەیە. شایانی باسە دەشتی مایدەشت خۆی بە تەنیا بەشێکی زۆری زەویە کشتوکاڵیەکانی ناوچەکەیە. دەشتی کرماشان لە باکوور بە بەرزاییەکانی پەڕاو و تاق وسان و لە ڕۆژئاوا بە بەرزاییەکانی باڵاوارز و هۆلانە دەگات. بەڵام لە باشوورەوە سفێ کوو ئەم زەویانە لە مایدەشت جیا دەکاتەوە. بەم شێوەیە ئەم دەشتە ٥٠ کیلۆمەتر درێژی و ٢٠ کیلۆمەتر پانی هەیە. دەشتی مایدەشت هاوتەریب لەگەڵ دەشتی کرماشاندایە، بەڵام ئەم دەشتە درێژاییەکەی بە ١٠٠ کیلۆمەتر دەگات لە حاڵێکدا کە لە ٨ کیلۆمەتر زیاتر

پانتایی نییە.[1]

ئەوپەری ڕۆژئاوای ئەم دەشتە چیای پەڕقرمزە و ئەوپەری ڕۆژهەڵاتەکەی نزیک بە چیای گەڵەیە. لە باکوور سفێ کوو مایدەشت لە دەشتی کرماشان جیا دەکاتەوە. لە لای باشوورەوە بەرزاییەکان زۆر نزمتر و لە زۆر شوێندا خاڵی نادیاریان هەیە. ڕووبارێک کە لە مایدەشتەوە تێپەڕ دەبێت بە مەرگ ناسراوە. ئاراستەی ئەم ڕووبارە باشووری ڕۆژهەڵات بۆ باکووری ڕۆژئاوایە و لە نزیک قەڵای سمایل تێکەڵ بە ڕووباری قەرەسوو دەبێت.

دەکرێت بڵێین ڕووباری ئاوتۆنە تەنیا لافاوێکی سادەیە کە لە بەرزاییەکانی ڕۆژهەڵاتی مایدەشتەوە سەرچاوە دەگرێت و بە شێوەی تاڤگە تا گاماسیاو دەڕژێتە خوارەوە. واتا ئەم لافاو شێوەیە لە خوارووی تەنگ گوولەدا بە ڕووباری گاماسیاو دەگات.

---

١- ژاک دمۆرگان: سەر لە بەیانی زوو کمیەنی چەرمێمان جێهێشت و لە کاتژمێر یەک بە مایدەشت گەیشتین. هەواڵمان پێگەیشت کە ئەو دوو کەسەی دوێنێ هاوکات لەگەڵ ئێمەدا بەڕێ کەوتبوون بە مردوویی دۆزراونەتەوە. ئەوان بە هۆی ئەو سەرمایەوە گیانیان لە دەست داوە کە ئێمەش بە هۆیەوە ناچار بە وەستان بووین. لە بارەی مایدەشتەوە دەبێت بڵێم کە ئەم دەشتە بە هۆی ڕووباری مۆرەکەوە بەراو دەکرێت و گشت ئەم دەشتە بە هۆی چاندنی گەنم داپۆشراوە. ئەم دەشتە بە عەمباری دانەوێڵەی کرماشان ناسراوە. سەرەتای ڕێگاکەمان بەرەو ناو دەشتەکە باتلاقی و قوڕ و لیتەیە و کاروان زۆر بە سەختی بەرەو پێشەوە دەچێت. بەفرەکان لە بەرزاییەکانەوە تووشی توانەوە هاتوون و بەرەو ناودەشتەکە ڕێگایان بڕیوە و لە ناو دەشتی مایدەشتیشدا زەویەکە زۆر ناسۆیی‌تر لەوەیە کە ئاوەکان ڕەت بکات واتا ئاوەکان بە هۆی ناسۆیی بوونی زەویەوە لە ناو دەشتەکەدا دەمێننەوە و ئەم قوڕو لیتەیە بەرهەم دەهێنن. لە مایدەشت ژمارەیەکی زۆر گوندی لێیە بەڵام لە بارەی دار دەبێت بڵێم کە لەم دەشتەدا بە تاکیش دار بەرچاو ناکەوێت. لە ناو گوندی مایدەشت کاروانسەرایەکی ڕازاوە دانراوە. دەگوترێت ئەم کاروانسەرایە لە لایەن شاعەباسەوە بنیاد نراوە. خەڵکانی ئەم ناوچەیە کوردەکان و ئێرانی(عەجەم)یەکانن کە بە زمانی کوردی کرماشانی و فارسی دەدوێن. لەم دەشتەدا ژمارەیەک تەپۆڵکەبوونیان هەیە کە ناسەواری بیناکانی سەردەمی کۆن و باستانیان هێشتا لە سەر ماوەتەوە (نووسینەکانی ١٩ی فێوریەی ١٨٩١ی ژاک دمۆرگان).



شێوەی ٣٨- تەنگەی گاماسیاو لە بەشی سەرووی گەراو.



شێوەی ٣٩- تاق وەسان و دەشتی کرماشان.

ئەم ناوچانە لە ڕووی زەویناسیەوە ڕووداوی توندیان بە سەردا هاتووە و لە ئاکامی ئەم ڕووداوانەدا چیای بەرز بەدیهاتوون کە چوون بۆ بەشی سەرووی ئەم بەرزاییانە ئەستەمە. هەروەها ئەم بەرزاییانە دانیشتووانی تیادا نییە و بە دارستان داپۆشراون. لە خوارووی ئەم دۆڵە تەنگەبەرانە زەردەڵان هەڵکەوتووە. دواتر بە گوڵدەرێ (واتا دۆڵی گوڵ) دەگەین کە لە دۆڵێکی قووڵی بچووکدایە کە بە چیا و داوێنە لێژەکان دەور دراوە و کۆچەریەکان تیایدا دەمێننەوە.

گوڵدەرە دوای دۆڵی تەنگەتیر هەڵکەوتووە[1] کە تیایدا ڕووبار بەرزاییە بەرزەکانی بڕیون.

---

١- ژاک دمۆرگان: سەر لە بەیانی زوو شوێنی حەوانەوەمان لە نزیک ئاوتۆنە جێهێشت. بە درێژایی شەو ڕێگرەکان کە وایاندەزانی من بۆ گرتنی ئەوان هاتووم بۆ ئێمە لە کەمین دابوون. بەڵام چونکە ئەوان جگە لە سیلاحی سادە شتێکی تریان نەبوو، نەیاندەوێرا بەرەو ئێمە هێرش بهێنن. سەگەکانی من بە درێژایی شەو ئاماژەیان بە بوونی ئەوان دەکرد. ئێمە بە دارستان گەیشتین و جگە لە زەردەلاڵ و گوڵ دەرە شوێنی دەرکەوتن لەم دارستانەمان نییە. ئەم دوو شوێنەی ناومان برد شوێنی حەوانەوەی کۆچەریەکانن کە هەندێ جارگەنم و جۆ دەچێنن. لە باشووری ئەم شوێنانە ڕووباری گاماسیاو لە دۆڵی زۆر قووڵ و ترسناک تێپەڕ دەبێت کە بە دۆڵی تەنگەڕەش ناسراوە. ئەم دۆڵە قووڵ و باریکە بە هۆی پیادا تێپەڕبوونی ئاوی ڕووبارەکە بەدیهاتووە. لە شوێنی دەرچوونی ئەم تەنگەیە پێشتر قەڵایەک هەبووە کە ئاسەواری ماوەتەوە. ئێمە لە نزیک ئەم قەڵایە بۆ حەسانەوەمان خێوەتەکەمان هەڵ دا (نووسینەکانی ٢٣ی ئاپریلی ١٨٩١ی ژاک دمۆرگان).



شێوەی ٤٠-ناوچەی زەردەلان.

لە بەشی ڕۆژئاوا هەلێران هەڵکەوتووە.[1] هەلێران دەشتێکی بچووکە کە بە هۆی ڕووبارێکی بچووک تێرئاو دەکرێت کە ئاوەکەی تاڵ و بۆ خواردنەوە نابێت و لە بەرزاییەکانی کاجاوەر سەرچاوە دەگرێت.

لە بەشی سەروی ناوچەی تەنگەبەرەکانی چیای شەیتان‌بازار باڵەومن هەڵکەوتووە کە ناوچەیەکی کوێستانیە و دانیشتووانی کەمە.

لەو شوێنەدا کە ڕووباری گاماسیاو بە سەیمرە دەناسرێت ئەوا ئەم ڕووبارە لە کەناری ڕاستەوە ئاوی ڕووباری کرندی تێکەڵ دەبێت. ئەم ڕووبارە کە تا ڕادەیەک

---

١- ژاک دەمۆرگان: هەلێران دەشتێکی بەرینی لاکێشەیە کە لەم وەرزەدا نزیک بە پازدە کۆمەڵی کۆچەری کە هەر یەکەیان هەشت تا دە بنەماڵەن لە خۆ گرتوون. هەلێرانیەکان لە کوردانی «لەکی»ن. ئەوان کەمتر کشوکاڵ دەکەن و زیاتر خەریک بە ئاژەڵدارین. هەلێرانیەکان لە وەرزی زستاندا لە کەناری ڕووباری گاماسیاو و لە وەرزی بەهار و پاییزدا لە دەشتی هەلێران و لە وەرزی هاویندا لە کوێستانەکاندا ژیان بە سەر دەبەن. لە ماوەی وشکی سادا ئاوەکانی هەلێران تاڵن و بۆ خواردنەوە نابن (نووسینەکانی ٢٥ی ئاپریلی ١٨٩١ی ژاک دەمۆرگان).

گرنگە ناوچەکانی کرند (کرێن) و هارونئاوا تێرئاو دەکات و هەروەها لە ئەیوان تێپەڕ دەبێت و لە بەشی سەرووی بەرزایی چارمن تێکەڵ بە گاماسیاو دەبێت.

ڕووباری کرند (کرێن) پێش گەیشتنی بە گاماسیاو ڕووبارێکی تری گەورە کە لە دەشتی گواوڕ لە ناوچەی کەلهوڕەوە سەرچاوەی گرتووە وەردەگرێت.

باس کردن لە گشت گوندەکانی دۆڵی ڕووباری گاماسیاو زۆر دوور و درێژ دەبێت بۆیە خۆمانی لێدەپارێزین. بەڵام ئەم ڕووبارە بە شێوەی ستوونی لە سەر ئاراستەی گشتی بەرزاییەکان ڕێڕەوی خۆی درێژە پێدەدات. کەوا بوو ڕووباری ناوبراو ناچارە لە دۆڵە باریک و قووڵ و تەنگەکان تێپەڕ ببێت و شوێنی خۆی بکاتەوە.

ئەمە تایبەتمەندی گشت ڕووبارەکانی لوڕستانە و جوانترین دیمەنەکان لەم ئەنجامەوە بەدی هاتوون. نابێت ئەمە لە بیر بکەین کە ئەم دۆخەش هاتوچۆ زەحمەت دەکات و تەنانەت کوێرە ڕێگاکانیش بۆ دەرچوون لەم دۆڵە تەنگەبەرانە ناچار بە دەوردانەوەی چەندین بەرزایی لە پشت سەری یەکن.

من دۆڵی ئاوکرند بۆ نموونە دەهێنمەوە کە لەم ڕووەوە کامڵترین تایبەتمەندیەکانی هەیە.

ئاوکرند (کرێن) دوو تا سێ سەرچاوەی ئاوی تیادایە. یەکێک لەوانە لە ڕۆژهەڵاتی چیای تەختگەرا لە بەرزایی ١٨٩٥ مەتری ئاستی ڕووی دەریایە و ئەوەیتر هەڵکەوتوو لە بەرزاییەکانی باکووری کرندە. ئاوی ئەم دوو سەرچاوەیە کە لە شێوەی ڕووبارن لە دۆڵێکی پان و فراواندا بە یەک دەگەن کە ناوەندی بەرزی لەم زەویانەدا ١٥٠٠ مەتر دەبێت. درێژی ئەم دۆڵە ٢٠ کیلۆمەتر و پانتاییەکەی بە ٥ تا ٦ کیلۆمەتر دەگات. لە باکوور بەرزاییە کلسیەکان ئەم دۆڵە لە دۆڵی بیوەنیج

جیا دەکەنەوە. لە باشوور چەماوە گەورەکەی چیای نووا سنووری ئەم دۆڵەیە.

ئاوی کرند لە کاتی دەرچوونی لەم دۆڵەدا بە دۆڵێکی تەنگەبەردا تێپەڕ دەبێت کە بە درێژایی چەند کیلۆمەترێک نزیک بە ۲۰۰ مەتر بەرزی ئاستی ڕێڕەوی ڕووبارەکە لە ئاستی ڕووی دەریاوە کەم دەبێتەوە. دواتر ئەم ڕووبارە بە دەشتی هاروون‌ئاوا دەگات و ئەم دەشتە بەراو دەکات کە ناوەندی بەرزی لە ئاستی ڕووی دەریاوە بە ۱۲۰۰ مەتر دەگات. شێواز و پانتایی دەشتی هاروون‌ئاوا دەکرێت بڵێین کە لە دەشتی کرند (کرێن) دەچێت. دواتر جارێکی‌تر ڕووبار بە دۆڵە تەنگەبەرەکان دەگات و بەرەو ئەیوان و چوواردوولی ڕێ دەکات کە بەرزی لە ئاستی ڕووی دەریاوە تا ۱۰۰۰ و دواتر ۸۰۰ مەتر دادەبەزێت.

لە چوواردوولی ڕووباری کرند (کرێن) لە ناو دۆڵە تەنگەبەرەکاندا لە بەشی سەرووی سەیمرە بە ڕووباری گاماسیاو دەگات کە سەرنج‌ڕاکێشترینی دۆڵە تەنگەبەرەکانی ئەم ناوچەیە بێگومان چوارمەن دەبێت. وەک بۆمان ڕوون بۆتەوە تۆپۆگرافیای ئەم بەشەی کوردستان لە ژمارەیەک دۆڵ و دەشت پێکدێت کە دەشتەکان یەک لە سەرووی ئەوی‌تریان هەڵکەوتووە و بە هۆی دۆڵە تەنگەبەرە قووڵەکانەوە بە یەک دەگەن.

دەشتەکانی ئەم ناوچەیە لە قووڵاییە گەورە سروشتیەکان دەچن کە نیشتەنیەکان تیایاندا کۆ بوونەتەوە. ئاوەکان جگە لەوەی کە لە چیا و بەرزاییەکاندا ڕێگەیەک بۆ تێپەڕبوونی خۆیان دەدۆزنەوە بە هەمان شێوە ڕێگە بۆ هەڵگرتن و گواستنەوەی نیشتەنیەکانیش بەرەو بەشە هەموارەکان پەیدا دەکەن.

من ئەو باسە کە لە بارەی ئاوی کرندەوە خستوومەتە ڕوو بۆ دەشتی کرماشان و مایدەشتیش ڕاستەوانەیە.

جیاوازی بەرزی ئاستی ڕووی دەریا لە سەرچاوەی ئاوی کرندەوە تا گەیشتنی ئەم ڕووبارە بە گاماسیاو نزیک بە ١٢٠٠ مەترە کە ئەم جیاوازی بەرزیـە بـە سـەر ١٢٠ کیلۆمەتردا دابەش بووە. بەڵام لە داوێنەکانی ڕۆژهەڵاتدا لێژاییەکان زۆر توند و هەڵدێرترن.

بۆ نموونە لە نێوان گەردەنەی تـاق‌گـرا (بـە بـەرزی ١٨٩٥ مـەتر) و شـاری بچووکی قەسری‌شیرین (بە بـەرزی ٥١٥ مـەتر) جیـاوازی بـەرزی ١٣٨٠ مـەتر بەرچاو دەکەوێت کە تەنیا لە دووری ٥٠ کیلۆمەتردا هەڵکەوتووە.

گرنگترین دۆڵەکانی داوێنەکانی زاگرۆس لەم ناوچەیەدا لە لای بین‌النهرینـەوە بریتین لە: دۆڵەکانی زەهاو و هەڵوان و کفراوڕ و گیەلان.

ئەم دوو دۆڵەی دوایی و ڕووبارەکانیان لە ناوچەی کەلهوڕدا هەڵکەوتوون.

ڕووباری زەهاو لە بەرزاییەکانی داروجانی زاگرۆسەوە سەرچاوە دەگرێـت و دەشتی بچووکی زەهاو بەراو دەکـات. دواتـر بەرزاییـە کلسـیەکانی ئاهەنگـەران و چیای بزینان دەبڕێت و بە ڕووباری دیالە دەگات. ڕێڕەو و لە بەر ڕۆیشتنی ئـاوی ئەم ڕووبارە زۆر ناڕێکوپێکە بە شێوەیەک کـە لـە وەرزی بـەهاردا لافـاوی و لـە مانگەکانی کۆتایی وەرزی هاویندا نادیار و کەم بەرچاو دەکەوێت.

ئاوی هەڵوان سەرچاوەکەی لە چیای تاق‌گرا و لە بـەرزی ١٩٠٠ مەتریدایـە. ئەم ڕووبارە سەرەتا لە شێوەی لافاوێکدایە کە دۆڵە تەنگەبـەر و قووڵـەکان تێـپەڕ دەکات و لـە چەنـد شوێنێـکدا تاڤگـەکان بـەدی دێنێـت. دوای چەنـد کیـلۆمەتر تێپەڕبوونێک ئاستی ڕێڕەوی ڕووبارەکە بۆ ١٢٠٠ مەتر دادەبەزێـت و بـە دەشـتی عەلی‌گردە دەگات. دواتر بەرزایی پیشکان دەبڕێـت و بـە دەشـتەکانی سـەرپێل و قەسری‌شیرین دەگات و بە تێپەڕبوونی لە شاری خانەقی تێکەڵ بە ڕووباری دیالـە

دەبێت. لق‌وپۆپەکانی ئەم ڕووبارە لە دوو بەش پێک دێن: بەشی یەکەم ئەو لقانەن کە لە کەناری ڕاستی ڕووبارەکەوە هەڵکەوتوون و لە بەرزاییەکانی زاگرۆسەوە سەرچاوە دەگرن. بەشی دووەم ئەو لقانەن کە لە کەناری چەپی ڕووبارەکەوە هەڵکەوتوون و لە بەرزاییەکانی کەلهوڕەوە بەرەو ڕووبارەکە ڕێ دەکەن.

ئەم ڕووبارە لە کەناری ڕاستەوە تەنیا ئاوی ڕەجەو وەردەگرێت کە ڕووبارێکی بچووکە و لە بەرزاییەکانی باڵۆلەوە سەرچاوە دەگرێت. دۆڵی ڕووباری ڕەجەو دۆڵێکی شاخاویە کە ڕووبارەکە تیایدا بە ناو شاخ و کەڤرەکاندا تێپەڕ دەبێت و یەکێک لە جوانترین سیماکانی ناوچەکەی پێک هێناوە.

دۆڵی ڕووباری ڕەجەو زیدەتر لە ٦ مەتر پانتایی نییە و دوو لای ئەم دۆڵە بە بەرزاییەکانی چەندسەد مەتریەوە دەور دراون. ئەو ڕووبارە دوای تێپەڕکردنی دووریەک تاڤگەیەکی بە بەرزی سەد مەتری بەدیٚ دەهێنێت. لەمە بە دواوە ئاوی ڕووباری ناوبراو لە دۆڵێکی قووڵ و باریکدا تێپەڕ دەبێت کە دیوارەکانی کەناری تا ١٥٠ مەتر بەرزیان هەیە. دووری ئەم دۆڵە تەنگەبەر و باریکە بە نزیکەی ٨ کیلۆمەتر دەگات.

بەڵام لە بەشی خوارووی دۆڵەکەدا ئاوەکان ئارام و لە سەرخۆ و لە هەمان کاتدا پیس بوون.

ئاوی هەڵوان لە کەناری چەپەوە ڕووبارەکانی کفراوڕ و گیەلان وەردەگرێت کە ئەوانیش بە هەمان شێوە لە دۆڵە تەنگ و باریکەکاندا ڕێڕەوی خۆیان تێپەڕ دەکەن. من لە باس‌کردنی چەند ڕووبارێکی بچووک کە لە ناوچەکەدا هەن و ئاوەکانیان تاڵە، خۆم دەپارێزم. ئەو ئاوانە گرنگی ئەوتۆیان نییە و بە هۆی تاڵبوونەکەیان گوند لە کەناری ئەو ڕووبارانەدا بنیاد نەنراون. هۆکاری تاڵی ئاوەکانیشیان بۆ

هەڵکەوتەی سەرچاوەکان لە پێکهاتە کلسیەکاندا دەگەڕێتەوە.

دوای گشت ئەو باسانە کە خستمانە ڕوو بە پێویستی دەزانم کە لە چەند دێڕێکدا باسێکی گشتی لە بارەی چەمانەوە و چیاکانی ناوچەکە بۆ خوێنەرە خۆشەویستەکان بخەمە ڕوو. من لە چیای ئەڵوەند دەست پێدەکەم کە شوێنی دەستپێکی ئەو هێزانەیە کە چەمانەوەکانیان لێوە بەدی هاتوون. ناوچەکانی نێوان هەمەدان و زەهاو بە تەواوی کوێستانییە. ئەم کوێستانانە بە بەشێک لەم دیوارە دادەنرێن کە هەمەدان (بە بەرزی ۱۸۷۰ مەتریەوە) لەگەڵ دەشتی بین‌النهرین(بەرزی بەغداد ٤٠ مەتر لە ئاستی ڕووی دەریاوە)دا لە یەکتر جیا دەکەنەوە.

جیاوازی بەرزی ۱۸۳۰ مەتری بەم شێوەیە و لە دووری ۳۰۰ کیلۆمەتریدا سەرنج ڕاکێشە. بۆ وێناکردنی باشتری دۆخی تۆپۆگرافیای ئەم بەشە لە مێشکی خوێنەردا هێنانی چەندیەتی بەرزی بەرزاییەکان لە ڕیزێکدا بەسە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| هەمەدان | ۱۸۷۰ مەتر | گەردەنەی زاخە | ۲۳٤۰ مەتر |
| کەنگەڤەر | ۱٥٦۰ مەتر | سەحنە (سێنە) | ۱٤۲۰ مەتر |
| بێستوون | ۱۳٦۰ مەتر | کرماشان | ۱٤۷۰ مەتر |
| ئارۆن‌ئاوا | ۱۳۲۰ مەتر | کرند (کرێن) | ۱۱٦۰ مەتر |
| تاق‌گرا | ۱۹۰۰ مەتر | قەسری‌شیرین | ٥۷٥ مەتر |
| خانەقی | ۳۲۰ مەتر | بەغداد | ٤۰ مەتر |

لە نێوان تۆپۆگرافیای جیاوازی دەشتە نزمەکانی بین‌النهرین و بانی بەرزی ئێراندا ئاستە قادرمەییەکان بەدی هاتوون کە پیادا تێپەڕبوونیان مومکینە، بەڵام لە هەندێ شوێندا زۆر ئەستەمە.

هەر یەک لە دۆڵ و دەشتەکان لەم ناوچەیەدا بە بەرزاییە هاوتەریبەکان دەور

دراون کە ئاراستەی گشتی باکووری ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژئاوایان هەیە. تا بەرەو ناو بانی بەرزی ئێران ڕێ بکەین لووتکەکان بەرزتر دەبن.

هاوتەریبی بەرزاییەکان لە نێوان زەهاو و هەمەداندا بۆ پاڵەپەستۆی چینەکان دەگەڕێتەوە کە لە باشوورەوە واتا لە لورستانەوە زەختیان بۆ سەر هاتووە. چەمانەوەکان لە نێوان سەحنە (سێنە) و زەهاودا ڕێکوپێکیەکی سەرنجڕاکێشیان هەیە کە پێدەچێت هۆکارەکەی بۆ ئەو پاڵەپەستۆیە بگەڕێتەوە کە لە کاتی پێکهاتنی بانی ئێراندا لە باکووری ڕۆژهەڵاتە و لە باشووری ڕۆژئاواوە بۆ سەریان هاتبێت. لە باکووری ڕۆژهەڵاتی هەمەدان پێدەچێت ڕووداوی زۆر بە سەر بەرزایی و چەمانەوەکاندا هاتبێت. ئەم چەمانەوانە بەرەو زەهاو واتا بەرەو باشووری ڕۆژئاوا نزمتر و دواتر جگە لە چەند شەپۆڵێک خۆیان بەدەر ناخەن.

لە نێوان هەمەدان و سنەدا پێکهاتەکان زۆر جیاوازن. لەم بەشەدا چینە نیشتەنیەکان زۆر دەگمەن بەرچاو دەکەون و جێگەی خۆیان بە پێکهاتە ئاگری و بورکانیەکان داوە. لێکۆڵینەوەی چینەکان لەم بەشەدا بە هۆی سەرکەوتن و بەرز بوونەوەیان زەحمەتە. من بەشی نێوان هەمەدان و کرماشانم بە خێرایی تێپەڕاند و لە کاتی تێپەڕبوونی مندا ناوچەکە بە بەفر داپۆشرابوو. من لەم کاتەدا توانیم پاشماوەی چەند ئاژەڵێکی کۆنی وەک براچیپۆدەکان و زەنچانلیدەکان و تێربراتولیدەکان و نۆسراموسەکان و چەند ئاژەڵێکی سەردەمی کرتاسە بدۆزمەوە و بیانناسمەوە. لە نزیک کرماشان من پێکهاتە کلسیەکانی نۆمۆلۆتیکم دۆزیەوە کە ئەم پێکهاتەیە لە ژێر گشت چینە خاکەکانی زەهاو بەرچاو دەکەوێت. ئەمە هەمان چینە کە تیایدا سامانی نەوت عەمبار دەبێت.

من لە ساڵی ۱۸۸۹دا لە باکووری ئێران پێکهاتەکانی دۆنین و کاربۆنیفێر و

ژووراسـیک و کرتاسـەم بینـی. بـەڵام لـە نێـوان هەمـەدان و زەهـاودا جگـە لـە پێکهاتەکانی ژووراسیک و کرتاسە و چاخی سێهەم پێکهاتەی‌ترم بەرچاو نەکەوت. ئەگەری ئەوەش هەیە کە لێکۆڵینەوەکانی من لـەم ڕووەوە بـە پەلـە و ناکـامڵ بـن. دەکرێت کە پێکهاتە کۆنەکان لە ڕوودا لە ناو چووبن، یا خود هێشتا لـە قووڵاییـدا شاردراوە بن. بە هـەر حـاڵ ئەمـە هـیچ پێـوەندیەک و کارتێـکەریەکی لـە سـەر لێکۆڵینەوەکانی سەر ڕووی زەوی و چەمانەوەکان و پێوەندی بەرزاییـەکان لەگـەڵ یەکتردا نییە. ڕێگای سەرەکی نێوان بین‌النهـرین و بـانی ئێـران تـەنیا لـە ڕێـگەی کرماشانەوەیە. لە ئێراندا لە نێوان نەهاوەند و کرماشان ڕێگاوبانەکان ئاساییین، بەڵام بەولاترەوە کە دەبێت بەرزاییەکانی زاگرۆس یاخود کەلهور تێپەڕ بکرێن ئەوا لێـژی ڕێگەوبانەکان لەگەڵ کێشەدا بەرەو ڕوو دەکات. کەوابوو ئەم بەشەی زاگـرۆس لـە ڕووی بازرگانی و هەروەها لە ڕووی سەربازیەوە گرنگـی زۆری هەیـە. ئەمـە بـە ساکارترین ڕێگەش بۆ تێپەڕبوون لەم زنجیرەیە دەناسرێت کە لە نێـوان عوسـمانی (عێراقی ئەمڕۆ) و ئێراندایە. من لە لاپەڕەکانی دواتردا ئەم باسە ڕوونتر دەکەمەوە.

شێوەی ٤١- چەمانەوەی چیاکانی کوردستان.

### سەرچاوە کانزاییەکان

بەرزایی و چیاکانی کوردستانی کرماشان هەر وەک بەرزاییەکانی لورستان سامانی کانزایی زۆریان تیادایە، بەڵام بە داخەوە تاوەکو ئێستا لێکۆڵینەوەی ورد و جیددی لەم بارەوە بە ئەنجام نەگەیشتوون.

من باس لە مەرمەرە ڕەنگیەکان و چینی ئەم مەرمەڕانە ناکەم. هەڵکەندنەکانی بێستوون و تاق وەسان هێمایەک بۆ ئەم بەکارهێنانەن کە دەکرێت لەم کەڤرانە وەربگیرێت. بەڵام کوردەکان و ئێرانیەکان بۆ بەکارهێنانی شتومەک و ڕێگاکانی بەم

شێوەیە سەخت زۆر تەمبەڵن و بەکارهێنانی خشت و بلۆکە ناشیرینەکانیان بۆ دروستکردنی خانوو لا باشترە کە نە جوانی تیایاندا بەدی دەکرێت و نە پتەوی و خۆڕاگری. لە گشت ناوچەکانی سەروو و لە بەرزاییەکاندا پێکهاتەی مەڕمەڕ بە شێوەیەکی بەرچاو بوونی هەیە. ئەم مەڕمەڕانە زیاتر هی سەردەمی کرتاسە و چاخی سێهەمن. لە بەشی خوارووتر واتا لە ناوچەکانی دەور و پشتی زەهاو پێکهاتەی گەچی بەرچاو دەکەوێت کە جوانترین دیمەنی ئەم پێکهاتەیە لە کەناری چەپی هەڵوان و لە بەرامبەر قەسریشیرینە. ئەم پێکهاتەیە توانای خۆڕاگری و پتەویەکی زۆری هەیە.

ئەم پێکهاتە گەچیانە بۆ سوورکردنەوە و دروستکردنی شتومەکە گەچیەکان زۆر شیاون. ئەم پێکهاتەیە لە دروستکردنی کۆشکەکانی ساسانی قەسریشیرین و حەوشکوڕیدا بە سەرکەوتوویی بە کار هاتوون. لە پێکهاتەکانی چاخی سێهەمدا پێکهاتەی لیگنیت (Lignite) لە سەرووی پێکهاتە گەچیەکانەوەیە کە ئەگەر ئەم پێکهاتەیە لە قووڵاییدا بێت دەتوانرێت مەوادی سووتەمەنی بە کەڵکی لێ بە دەست بهێنرێت. سەرنجڕاکێشترین پێکهاتە کانزاییەکانی ئەم ناوچەیە کاربۆنەکانی چاخی سێهەمن کە لە بەرزاییەکانی کەلهوڕ و لە نزیک گیەلان هەڵکەوتوون.

بەڵام سامانێکی گرنگتر لەوانە لە ناوچەکەدا کە بە گرنگترین سامان دەناسرێت بە دڵنیاییەوە نەوتی نێوان شاری کەرکووک تا پشتکۆیە. من لە کۆشکیشیرین و سەرپۆل ئەم مادەیەم بینیوە و لە سەر پێکهاتەکەی بە وردی خوێندنەوەم بووە.

کێڵگە نەوتیەکانی ناوچەی زەهاو لە داوێنی زاگرۆسدا (چیاکانی نەوا و ناهەنگەران و سەگرمە و قەرەداخ) هەڵکەوتوون. ئاراستەی ئەم کێڵگانەش بە گشتی باکووری ڕۆژئاوا بۆ باشووری ڕۆژهەڵاتە کە یەکێک لە گرنگترینی ئەم

ناوچە نەوتیانە کەرکووکە کە نەوت و قیری تیادایە و ناوچەیەکی تری گرنگی نەوتی لە نزیک قەسری‌شیرین و چیای شاکۆیە لە ناو خاکی ئێراندا هەڵکەوتووە.

ئەگەری زۆر هەیە ئەم ناوچە نەوتیانە بەرەو باشوور و باکوور درێژەیان هەبێت، بەڵام بۆ ئەمڕۆکە بە پێی ئەو زانیاریانە کە من هەمە ئەم دوو ناوچەیەی باس کراون لە ناوچە گرنگە نەوتیەکانن.

ناوچەی کۆشکی‌شیرین لە ناوەڕاستی ئەو ناوچە نەوتیەدا هەڵکەوتووە کە لە داوێنی بەرزایی ئاهەنگەرانە و بەرزی لە ئاستی ڕووی دەریاوە ٤٨٠ مەترە. کۆشکی‌شیرین بە سەر ڕووباری چیاسورخدا دەڕوانێت. لە نزیک ٤ کیلۆمەتری ئەم ناوچەیە بەرەو خواروو گوندی بچووکی کۆشکی‌شیرین هەڵکەوتووە و لە ١٨ کیلۆمتری ئەم ناوچەیە بەرەو خواروو بە قەسری‌شیرین دەگەین. دەور و پشتی سەرچاوە ناوچەیەکی تەختە و بە هۆی دەرکەتنی پێکهاتەیەکی چاخی سێهەم کە پێکهاتەیەکی لاوازە کۆمەڵێک گرد و تەپۆڵکە پێک هاتوون. ئەم ناوچەیە بە هۆی زنجیرەیەکی بچووک لە بین‌النهرین جیا دەکرێتەوە. ئاخ‌کێو هەڵکەوتوو لە ٢٤ کیلۆمەتری سەرچاوە زنجیرەی بەرزایی سنووری نێوان ئێران و عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) لەم ناوچەدایە.

سەرچاوە لە ١٥٠ کیلۆمەتری بەغداد لە ڕێگەی خانەقیەوە و ١٦٨ کیلۆمەتری کرماشان لە ڕێگەی تاق گراوە هەڵکەوتووە. گوتمان کە چەمانەوەکان تا لە ئێران بەرەو بین‌النهرین ڕێ بکەین نزمتر و گرنگی کەمتریان هەیە. لە ناو ئەم چەمانەوە لاوازانەدا کێڵگەی نەوتی هەڵکەوتوون.

سەرچاوە لە شوێنی یەکتربڕینی ڕووباری چیاسورخ و هێڵی دابەش‌کردنی ناویدا هەڵکەوتووە. ئەم سەرچاوەیە بوونی دەریاچەیەکی نەوتی لە ژێریەوە بەرچاو

دەکەوێت.

ئەم چینانە لە لای ڕاست و چەپی هێڵی دابەش‌کردنی ئاوەوە لە ڕۆژئاوا ١٢ پلە بەرەو باکوور و لە ڕۆژهەڵات ١٢ پلە بەرەو باشوورە. کاتێک لە هێڵی تێکشکانی ئەو چینانە دوور دەکەوینەوە، ئەوا هێواش‌هێواش لاریەکەیان کەمتر دەبێتەوە و پانداژ (ناراستەی چینەکان لە ڕووی زەویناسیەوە یا خود ڕەگی کانزا)یک بەدیٍ دێت کە لە نێوان ٧٥ پلە و ١٨ پلەدا گۆڕاو و لە گۆڕاندایە (لە ١٥٠٠ مەتری سەرچاوەدا).

نیشتەنیەکانی لای چەپ و ڕاستی هێڵە شکاواییەکە لە یەک دەچن، بەڵام کێڵگەکان ناڕێکوپێک و نایەکسانن. یەکێک لەم کێڵگانە کە لە بەشی باکوور هەڵکەوتووە پانتاییەکەی بە ٥٠٠٠ مەتر دەگات و دووریەکی کەمی لە داوێنی چیای ئاهەنگەران هەیە. ئەوەی‌تر لە ئاخ‌کێنو کۆتایی پێدێت و لە ژێر چینە نیشتەنیەکاندا بزر دەبێت.

لە داوێنی چیای بزیناندا و لە نزیک چیای ئاهەنگەران شارێکی گرنگ هەڵکەوتووە کە تیایدا چینەکانی سەرووتر بە کۆتا گەیشتوون و کلسە نۆمۆلۆتیکەکانی ئەئۆسن دەرکەوتوون. هەر چەندە کە ئەمڕۆ ئەم چینانە ٤٠٠ مەتر لە سەرووی چینە نیشتەنیەکانی دەشتەکان هەڵکەوتوون، بەڵام لە ڕووی زەویناسیەوە دەبێت لە ژێر چینە نیشتەنیەکاندا بووبن. چینە ئەستوورەکانی پێکهاتەی گەچی لە نزیک شاری قەسری‌شیرین بەرچاو دەکەون کە ئەگەری ئەوە هەیە لە هاوسێیی ئەوان جێ مابن، بەڵام پێدەچێت ئەم چینانە هەر لەم ڕووەدا لە نزیک کۆشکی‌شیرین بزر بووبن.

دوای باسکردنی چینەکان و کانزاکانی ناوچەکە، باشێکی دوور و درێژتر و

ڕوونتر سەبارەت بە نەوت لە ناوچەکەدا پێشکەش دەکەین.

باسمان لەوە کرد کە چینەکان تووشی چەمانەوە هاتوون، بۆیە دەکرێت بڵێین کە دوو لای هێڵێکی دیاریکراو لە ڕووی پێکهاتەی زەویناسیەوە لە یەک دەچن، بەڵام لە ڕووی چۆنیەتی چینەکان و شێوازەکانی کە وەریان گرتوون لە یەکتر جیاوازن.

چینەکان بەم شێوەیە لە سەروو یەکتردا هەڵکەوتوون:

١- مارنە سوورەکان کە کون کونن و ڕەگی ڕەنگی قاوەییان تیادا بەدی دەکرێت و تا ڕادەیەک شێوازی سەوزیش وەردەگرێت (ئەستووری چین: نادیار).

٢- مارنی چەوری قاوەیی بە پشتێنەی خۆڵەمێشی کە تیایدا چاڵ و قووڵاییەکان بەدی دەکرێن (ئەستووری چین: ٦ مەتر).

٣- مارن کە ڕەنگەکەی بەرەو سوور دەچێت لەگەڵ پشتێنەیەک لە مومیا (ozokerite) و زیخی مارنیدا (ئەستووری چین: ٦/٥ مەتر).

٤- زیخی مارنی بە ڕەنگی قاوەیی و سوور و خۆڵەمێشی بە شێوەی تاشەبەرد (ئەستووری چین: ٤/٥ مەتر).

٥- زیخی قاوەیی بە پێکهاتەیەکی لاوازەوە (ئەستووری چین: ١/٨ مەتر).

٦- مارن بە پێکهاتەی وردە بەردەکانەوە، سوور و قاوەیی (ئەستووری چین: ٥ مەتر).

٧- زیخی مارنی، چین‌چین و ڕەنگی سوور بۆ قاوەیی و پێکهاتەی زۆر پتەو (ئەستووری چین: ٩ مەتر).

٨- مارنی چەند ڕەنگ (ئەستووری چین: ١٢ تا ١٥ مەتر).

٩- زیخی مارنی بە ڕەنگی قاوەیی و بە پێکهاتەی زۆر لاوازەوە (ئەستووری

چین: ٨ تا ١٢ مەتر).

١٠- زیخی ڕەنگ سەوز بە پێکهاتەیەکی زۆر پتەو و چەندین چینی ٠/٤ تا ١/٨ مەتر لە سەر یەک (ئەستووری چین: ٧/٥ مەتر).

١١- مارنی چەند ڕەنگ بە چینی ئەستووری گەچیەوە (ئەستووری چین: ٢٨ مەتر).

دیاریکردنی تەمەنی ئەم چین و پێکهاتانە زۆر زەحمەتە. بەڵام دەزانرێت کە هی سەردەمی ئەئۆسینن. ئەمە تەنیا دیاریکردنێکە کە لە بارەی تەمەنەوە دەتوانم بیخەمە ڕوو. ڕێژەی خوێ لە گشت ئەم پێکهاتانەدا بەرزە.

لە چینەکانی مارنی نمرە ٣دا تایبەتمەندی مومیایی (ozokerite) بەدی دەکرێت. ئەم ڕەگانە کەمتر بەدی دەکرێن و کەمتر دەبینرێت کە ئەستووری زۆریان بێت. درشتی شانە لەم پێکهاتانەدا لە نێوان ٢ تا ٣ میلیمەتر دایە. هەندێ جار لە نێوان ١/٥ تا ٢ سانتیمەتریشدا لە گۆڕاندایە. ئەوان بە هۆی دەرکردن و پیادا تێپەڕبوونی ڕۆنی کانزایی بە ناو مارنەکاندا بەدیهاتوون. ئەم بابەتە لە ناو گشت کانزا نەوتیەکاندا هاوبەشە و لێرەدا ئەم بابەتە گرنگی زیدەتری لە هی کانزاکانی تر نییە. ئەم پێکهاتە مومیایی (ozokerite)ە قابیلی دەرهێنان و بەکارهێنانی جیددی نییە. ئەوان لە سەقفی کانزاکاندا کۆ بوونەتەوە، کەواتە لە ڕووبەرێکی بچووکدا بەرچاو دەکەون. بەڵام لە ڕاستیدا بوونی مومیایی (ozokerite) لە سەرووی کانزاکان سەلمێنەر و دیاریکەری گرنگی کانزا بە ئەژمار دێت. پێویستە زیاتر لێکۆڵینەوەکەمان بە لێکۆڵینەوەی نەوتی دەوڵەمەند بکەین، چونکە بە پێی زانیاریەکان بڕێکی زۆر نەوت لە ناوچەکەدا بوونی هەیە و لەم سەردەمەدا زێدەتر لە کانزانی تریش نەوت گرنگترە.

بینیمان که له دوو لای هێڵێک که لێیەوه نەوت دەدرەکەوێت دوو حەوز به قەبارەی نایەکسانەوه بوونیان هەیه. هەروەها لەم حاڵەدایە که ئەم هێڵی دابەشکردنه له لایەن ڕێڕەوی ڕووبارێکەوه که ڕۆنی کانزایی تیادا بەدی دەکرێت بڕدراوه. دەمێنێتەوه که هەڵکەوتەی گەورەکانی ناو سەرچاوەکه که نەوتی پیادا دەچێت بۆ سەرچاوەکان لێکۆڵینەوەیان له سەر بکرێت.

یەکەم ئەگەر ئەوەیه که سەرچاوه دەرەکیەکان دروست له سەروو گەروه ناوخۆییەکان هەڵکەوتبن و نەوت ڕاستەوخۆ له شوێنی سەرەکی خۆی بەرەو دەرەوه بێت.

ئەم ئەگەره هیچ لایەنێکی وەهای تیادا نییه که به نامەعقوول بزانرێت. چونکه لەم ڕوانگەوه که چینەکان له هەر دوو لای ڕاست و چەپ به شێوەی لار له سەر یەکتر هەڵکەوتوون، بۆیه بەردەوام نەوت له ژێر پاڵەپەستۆ و فشاردا دەبێت و بەم هۆیەوه ئەم نەوته بەردەوام هەوڵی هاتنی بەرەو بەشەکانی سەروو دەدات و لەم کاتەدا سەرسووڕهێنەر نیه که هەندێ جار لەم چاڵ و بیره ئاویانەدا که له لایەن خەڵکەوه هەڵکەندراون نەوت ببینرێت و تا بەتاڵکردنی بیر زیاتر به درەنگی بکەوێت ئەوا بڕێکی زیاتر نەوت تیایدا کۆ دەبێتەوه. لەم حاڵەتەدا هەروەها ڕۆنه کانزاییەکەش به جێگەی بوونی له ژێر پاڵەپەستۆی چینەکانی زەویدا تا ڕادەیەک که بۆی مومکینه بەرەو دەرەوه واتا ناو بیرەکان دەکشێت.

بەڵام ئێمه زیاتر بیروڕامان وایه که گەرووی ناوخۆیی یەکێک لەم دوو حەوزەی باسکراوی باشوور و باکوور لەو شوێنەدا که کەلێنەکانی ناو خاک پڕ بوون، واتا به ڕادەی تێر بوون گەیشتوون کرابێتەوه و دەریاچەیەکی ناوخۆیی که سەرچاوه شوێنی لاوەکی و هاوسێییەتی بەدی هاتبێت.

کەوابوو لەم بوارەدا بە شێوەیەکی گشتی دەبێت چەمانـەوەکانی کـە بـەرەو نـاو زەوی واتا لە قووڵایی دەچن زیاتر لە بەشە زەویە بەرزبووەکان هەڵگر و بدەر بن.

ئێستا کە نـاتوانین بڵێـین کـە نـەوت لـە بەشـە بـاکوور یـا خـود باشـووردا هەڵکەوتووە و ئەم وڵامە تەنیا بە لێکۆڵینەوە وردەکان وڵام دەدرێتەوە. بەڵام ئەوەی کە سەلماوە و لێیەوە دڵنیا بووینەتەوە ئەوەیە کە نەوت لەم ناوچەیەدا بوونی هەیە و قەبارەیەکی زۆریشی هەیە. بەڵام لە بارەی چەندیەتی کانزاکانەوە زانیاری وردمـان لەملا و لەولا دەست کەوتووە. بەڵام ئەم زانیاریانـە لەگـەڵ دیراسـە مەیدانیەکانـدا بەراورد نەکراون. بەڵام من تەئکیـد دەکەمـەوە کـە بـوونی وەهـا سـەرچاوەیەک و مەیدانێک بە قەبارەیەکی یەکسانی سـامانی کـەرکووک لـە بـاکووری پشـتکۆ بـە درێژایی زیاتر لە ۳۰۰ کیلۆمەتر بە ڕواڵەت نابێت گرنگی کەمی ببێت.

ئەو چالاکیانە کە ئەمڕۆکە لەم ناوچەیەدا بە ئەنجام دەگەن مێژوویەکی کۆنیـان هەیە. ئەمە لە ڕووی ئەو ژمارەیە زۆرە لە بیرەکان کە هێشتا بەرچاو دەکـەون ڕوون دەبێتەوە. واتا دانیشتوانی ئەم ناوچانە بەم شێوەیە بیری نەوەکانی پێشووی خۆیانیان بۆ کەڵک وەرگرتن لەم سامانە پاراستووە.

کوردەکان قووڵەکانی کە هەڵیان دەکەنن بە قووڵی ۸ مەتر و پانتایی ۳/۵ مەتر و بەشی سەرووی چاڵەکە بە ٦ مەتر دەگات. بۆ چوونە ناو ئەم قووڵانە یـاخود بـۆ دەرکەوتن لێیانەوە کەڵک لە قادرمە وەردەگیرێت. لە نزیک ئەم قووڵاییە یـا باشـتر وایە بڵێین لە نزیک ئەم بیرەدا دوو بیری‌تری بە قووڵایی ۹ مەتر بـەرچاو دەکـەون کە لە ڕووی فراوانیەوە بچووکترن.

ئاوە سوێرەکان و هەروەها نەوت لەم دوو بیرانەدا کە باسـمان لێـوە کـردن کـۆ دەبنەوە و بە ٤ تا ٥ ڕۆژ ئەم بیرانە بەتاڵ دەکرێن. لە هەر جارێ لەم بەتاڵکردنانـەدا

نزیک بە ٢٥٠ لیتر ڕۆنی خاو و بڕێک ئاوی سوێـر لـە بیرەکـان دەڕژێـتە دەرەوە. بەتاڵ کردنی بیرەکان بە کەڵک وەرگرتن لە پەتێکی درێژ و سەتڵێکەوە بـە ئـەنجام دەگات. نەوتی دەستکەوتوو لە شوێنێکدا کە پێشتر بۆی ئامادەکراوە کۆ دەکرێتەوە و ئاوە سوێرەکان لە بەشێکی تری زەویەکەدا دێنە ڕشتن تا تووشی بەهەڵمبوون بێنەوە. دە تا دوازدە کەس بە درێژایی ڕۆژ ئەم ئیشە پڕ ماندووبوونە بە سەر دەبەن و هـەر یەکەیان ڕۆژی یەک قران وەردەگرن.

ئاوە سوێرەکان کە تووشی بەهەڵمبوون دەبن خوێ لە پاشی جێ دەمێنێت. دوو کیلۆ لەم خوێیانە بە پێنج شایی بە فرۆش دەگات، بەڵام ئەم خوێیانە بە شێـوەیەکی خراپ ڕادەگیرێن و بۆنی نەوت دەدەن.

لە بارەی ڕۆنی خاو دەبێت بڵێم کە بـە پشـتی وڵاخ تـا قەسـری‌شـیرین بـار دەکرێت و لەم شارەدا دوو لیتر بە یەک تمەن بە فرۆش دەگات. واتا سێ شایی بـۆ یەک لە سەر سێی هەر لیترێک. لە قەسری‌شیرین ڕۆنی خاو دەپاڵێورێـت و دوای ئەم کردارە هەر دوو لیتر لەم ڕۆنە پاڵێوراوە بە دوو تمەن دەفرۆشرێت.

ئەم ڕۆنە خاوە زۆر شل‌بۆنێکی توندی هەیە. ئەو چاڵ و بیرانە کـە کوردەکـان هەڵیان دەکەنن کەمتریان بەم چینانە لە زەوی دەکەن کە نەوتیان تیادا کۆ بۆتەوە.

من باس لەوە ناکەم کە ئەم کانزا و نەوتانە لای ئێران -حکومەتی ئێـرانی- چ گرنگیەکی هەیە.

ئەمەش دەزانین کە گشت ئەو نەوتانە کە لە چـین و هێـند و ئێـران و عێـراقی ئەمڕۆ دەسووتێنرێن و بەکار دەهێنرێن لە بـاکۆ یـا پێنلیسـوانیا دەهێنرێـن. کەڵـک وەرگرتن لەم سامانانە بۆ هەر وڵاتێک سەرچاوەی داهاتێکی مەزن دەبێت. ئەمەش لە جێگەی خۆی بێت کە نەوت بەشی تەنانەت یەک چرا لە وڵاتێـکی وەک ئێـران

بە نرخێکی زۆر بەرز دەست دەکەوێت!

بۆ ناردنە دەرەوە نزیکترین بەندەر بەغدادە. ئەمە لە حاڵێکدایە کە نەوتەکانی باکۆ ناچارن تا کاناڵی سوێز تێپەڕ بکەن و بە هێند بگەن. نەوتی زەهاو ڕاستەوخۆ بە هێند دەگات و لەگەڵ نەوتی باکۆدا کێبڕکێ دەکات.



شێوەی ٤٢-نیوەڕو (پرۆفیل)ی زەوی و کێڵگە نەوتاویەکان.




شێوەی ٤٣-نیوەڕو (پرۆفیل)ی چیای بزینان.




شێوەی ٤٤-نیوەڕو (پرۆفیل)ی پێکهاتە بەردیەکانی نزیک سەرچاوە نەوتیەکان.




شێوەی ٤٥-نیوەڕو (پرۆفیل)یەک کە گومانی لێدەکرێت سەرچاوەی نەوتی لە بەشی باکووری هەبێت.




شێوەی ٤٦-نیوەڕو(پرۆفیل)ی پێکهاتە بەردیەکانی نزیک سەرچاوە نەوتیەکان.

## ئاووهەوا، سامانی ئاژەڵ و ڕووەکی سروشتی

بە ڕوونی دەردەکەوێت کە لە ناوچەیەکدا بەم ئاستە تۆپۆگرافیا جیاواز بێت و بەرزایی و دەشت و دۆڵە نزمەکان بەم شێوەیە کە هەیە خۆ بنوێنن ئەوا ئاووهەوایەکی یەکسان بەدی ناکرێت و جیاوازیەکان سەرسووڕهێنەر نابن. دەشتەکانی کرماشان و مایدەشت بە بەراورد لەگەڵ ناوچە بەرز و شاخاویەکاندا ئاووهەوایەکی مامناوەندیان هەیە. بەڵام بە بەراورد لەگەڵ دۆڵ و ناوچە نزمەکاندا هێشتا ئاووهەوایەکی ساردیان هەیە.

لە کرماشان بەفر کەمتر دەبارێت و سەرما لە ناوەڕاستی دوایین مانگی وەرزی پاییزەوە دەست پێدەکات و تا کۆتاییەکانی مانگی خاکەلێوە واتا یەکەم مانگی وەرزی بەهار درێژە دەکێشێت. لەم کاتەی ساڵەوە بە دواوە ئیتر بەفرەکان تووشی

توانەوە دەبن و ناوچەکە سەوزپۆش دەبێت. بە هۆی بەرزاییەکانەوە کـە دەوری دۆڵ و دەشـتەکانیان داوە ئـەوا بـە درێـژایی وەرزی هـاوینیش ئـاوی پێویـست دەسـت دەکەوێت. گەرما لەم ناوچەیەدا هەرگیز سەرەڕۆ و بە ڕادیەکی زۆر بەرز ناگـات و شەوانی ناوچەکە فێنکن.

لە ناوچەی کەلهوڕەکاندا و لە بەرزاییەکانی نێـوان کـەناری ڕاسـتی ڕووبـاری گاماسیاو و دەشتی مایدەشتەوە واتا لەو شوێنانەدا کە ئاووهەوا مامناوەندتر و بـەفر زۆر بە دەگمەن دەبارێت ئەوا کۆچەریەکان لەوەڕگەی باشیان هەیە و لەم شوێنانەدا دەحەوێنەوە. لە وەرزی هاویندا بە پێچەوانەوە ئەم کۆچەریانە بـەرەو بەرزاییـەکانی بەرزتر لە ٢٥٠٠ مەتر کۆچ دەکەن و شوێن ئاووهەوا فێنکەکان دەکەون.

ناوچەی زەهاو لە ڕووی ئاووهەواییەوە بە دڵڕفێنترین شوێنی ئێران ناسـراوە. ئەم شوێنە لە داوێنی بەرزاییە پڕبەفرەکانی زاگرۆسدا هەڵـکەوتووە و بـە درێـژایی وەرزی هاوین تێرئاوە. هەروەها با ساردەکانی باکوور و باکووری ڕۆژئاوا نـاتوانن ئەم کەشە دڵڕفێنە تووشی شێواوی بکەن. ئەم بەشە لەگەڵ وەرزی زسـتاندا ئاشـنا نییە و بەفر تەنیا لە لووتکەکاندا دەبارێت کە دەوری زەهاویان داوە. وەرزی بەهار لە زەهاو پڕبارانی و بارانی لە دوای یەکمان لە بیردا دەنەخشێنێت.



شێوەی ٤٧- چنارەکانی دۆڵی ڕووباری تونە.

مانگی کۆتایی زستان و دوو مانگی سەرەتای بەهار کاتی دەرکەوتنی گوڵ و ڕووەکەکان لە زەهاوە ئەمە لە حاڵێکدایە کە ١٠ تا ١٢ فەرسەنگی ڕۆژئاوای زەهاو هێشتا داپۆشراوی بەفرە.

لە کاتی هاتنی ئێمەدا بەرەو زەهاو لە بەرزاییەکانی ڕێگەدا و لە بانی بەرزی

ئێران سەرمایەکی زۆرمان چێشت. ئێمە لە ماوەی ڕۆژێـکدا دووری نێـوان چیـای تاق گرا و سەرپێەڵمان تێپەڕ کرد و دوای چەند کاتژمێرێک بەهار بۆ ئێمە جێگەی زستانی ساردی گرتەوە. ئەستەمە هەستی ئێمە لـە دەربـاز بـوون لـەم سـەرمایە و گەیشتنمان بەم بەهارە دڵڕفێنە بزانن. هەستمان کرد کە لەم سروشتە سەرسەوزەدا و لە ژێر ئەم خۆرەدا گشت ڕۆژانی ساردی ڕابردوومان لە یاد چوو.

لە وەرزی بەهاردا و تا ئەو ڕۆژە کە بارانەکان کۆتاییـان پێـنەهاتووە ناوچەکـە سەرسەوزی و جوانی خۆی دەپارێزێت. بەڵام لە کاتی گەرمای سـەرەتای مـانگی سێهەمی بەهار و دوای نەبارینی بارانە بەهاریەکان گشت ئەو ڕووەکانـە کـە ئـاوی جۆگاکان و ڕووبارەکان پێیان نەگات لە سەر پۆل تووشـی وشـکبـوون دەبنـەوە. بەرزاییەکان و چیاکان ڕەنگێکی خۆڵاوی بە خۆ دەگرن و گەر کەسێک لە سێبەر و فێنکی بگەڕێت دەبێت پەنا بۆ شاخەکان و داوێنەکانی زاگـرۆس ببـات. بـەڵام لـە بارەی ناوچەکانی نزیک سنووری عوسمانی (عێـراقی ئەمـڕۆ) دەبێـت بڵێـم ئـەم ناوچانە دانیشتووانی کەمی تیادا مـاوە. ئـەم ناوچانـە بـا گـەرم و سووتێـنەرەکانی باشووری ڕۆژئاوا دەگرنەوە و لە با فێنکەکانی باکووری بێبەشن و جگـە لـە ئـاوە سوێر و تاڵەکان نیانە. کەسێک گەر لە وەرزی هاویندا سەردانی ئەم ناوچەیە بکات خۆی تووشـی کێشـە دەکـات. پلـەکانی بـەرزی گـەرمی لـەم وەرزەدا لـە گشـت بین‌النهرین و شووش و سنجار و ناوچەکانی باشووریتـر و کـەنارەکانی کەنـداوی فارس بەدی دەکرێت. لەم ناوچانەدا دەکرێت گەرمای سەخت هەست پێبکرێت.

لە ناوچە نزمەکانی کەلهوڕیشدا پلەکانی گەرما تا ڕادەیەکی زۆر بەرز دەبنـەوە، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە ناوچەکە داپۆشراو بە دارستانە هاوسەنگیەک ڕادەگیرێـت. ئەم دۆخە بـۆ هەڵێـران و زەردەڵان و باڵـەوەن و ناوچـەکانی نێـوان مایدەشـت و

ڕووباری گاماسیاویش بە هەمان شێوەیە.

ئەوەمان لە یاد نەچێت کە پلەکانی گەرمی لێرە هەرگیز بە ڕادەی ناوچەکانی بین‌النهرین بەرز نابنەوە و ئەمەش بە هۆی‌بوونی ئەم بەرزاییانەوەیە کە ڕێگە لە هاتنی با گەرم و سووتێنەرەکانی باشوور و باشووری ڕۆژئاوا دەگرن. کوردستانی کرماشان یەکێک لەو ناوچانەیە کە ڕووبەرێکی زۆری بە ڕووەک و دارستان داپۆشراوە و لەم ڕووەوە بە ناوچەیەکی دەوڵەمەند دێتە ئەژمار. جگە لە ناوچەکانی زەهاو و دەشتی کرماشان و مایدەشت و شاخەکانی نزیک بێستوون گشت ناوچەی کوردستانی کرماشان بە ڕووەک و دارستان داپۆشراوە. دارەکانی ناوچەکە تێکەڵ و نارێک و پێکن و ئەم تایبەتمەندیەی دارستانەکانی کرماشان جوانیەکی تایبەتیان بە سروشتی ناوچەکە بەخشیوە.

لە دەشتە بەرزەکاندا داری سپیدار و چنار و بی هەروەها دارەکانی میوەی باکووری ئەورووپا بەرچاو دەکەون. بە باشی پارێزگاری لە باخەکان دەکرێت و بەردەوام ئەم دارانە تێرئاون و لەم حاڵەتەدا باخەکان شێوازی دارستان بە خۆیان دەگرن. بەڵام لە بەرزایی و داوێنەکاندا دارەکانی بەڕوو و هەنجیر بەرچاو دەکەون.

سەرپۆل یەکەم شوێن بوو کە تیایدا داری خورمام بینی. ئەم دارخورمایانە تەنیا چەند ساڵێکە لەم ناوچانەدا کردراون. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە باشی گەشەیان سەندووە، بەڵام هێشتا وەک دارەکانی خورمای باخی شای قەسری‌شیرین نابن. ئەوان لە هاوسێیەتی دارەکانی هەنجیر و پرتەقاڵ و نارنج و هەنار گەشە دەکەن. لە بارەی ئەو ڕووەکانەدا کە بە باشی لە شوێنێکی وەک ئەم گۆشەیە لە خاکی بیابانیدا گەشە دەکەن و لە بارەی ئەو ڕووەکانەدا کە لە باخی قەسری خوسرەودا بوونیان هەبووە بە ئاسانی لێکدانەوەمان بۆ دەکرێت. ئەمڕۆکە یەک دانەش لەم دارانە

بوونیان نییە بەڵام وێناکردنیان لە مێشکماندا زەحمەت نییە. ئەو دارستانە کە زۆرێک لە جۆری دارەکانی تیادایە و لە هەمان کاتدا ژمارەیەکی زۆری جۆری ئاژەڵی لە خۆ گرتبوو بە فەرمانی سوڵتان بۆ ڕاوی شا بنیاد نرابوو.

بەرزایی ڕەجەو شوێنێکی گواستراوە لە نێوان ڕووەکی بەرزاییەکان لەگەڵ ڕووەکی ناوچە نزمەکاندایە. هەنار و هەنجیر لێرەدا بە باشی گەشە دەکەن و دارەکانیان تا ڕادەیەکی باش گەورە دەبن، لە حاڵێکدا کە لە کرند (کرێن) ئەم دارانە لاواز و باریک دەمێننەوە و جگە لە دەشتەکانی کرماشان و مایدەشت توانای زیندوومانیان نییە.

گشت دارەکانی میوەی ناوچە مامناوەندەکان لە باخەکانی ڕەجەودا بەرچاو دەکەون. مێوەکان لێرەدا وەها گەورە دەبن کە توانای داپۆشینی دارە گەورەکانیان هەیە. باسی میوەی وشککراو لە بازرگانیدا باسێکی گرنگە کە بۆ ئەم ناوچانە لەم بوارەدا هەنجیری وشککراو بوونی هەیە و باشترین هەنجیرێکی وشک کراوە کە بینیومە.

جگە لە میوە و سەوزە و باخەکان لەم ناوچانەدا کشتوکاڵی تریش بەرچاو دەکەوێت. لە ناوچە ساردەکان گەنم و جۆ و گەنمەشامی و هەرزن و ماش و خەشخاش تەنانەت کشوکاڵ دەکرێت. لە خەشخاش بۆ دروستکردنی تریاک کەڵک وەردەگیرێت. بەڵام لە ناوچە گەرمەکاندا بە پێچەوانەوە برنج و لۆکە و... هتد کشتوکاڵی پێوە دەکرێت. برنجەکانی ناوچەی زەهاو زۆر ڕەق و ناشیاون. ئەم برنجانە توانای بەراوردکردنیان لەگەڵ برنجی گیلان و مازەندەراندا نییە کە لە گشت ئێراندا بازاڕی باشیان هەیە. واتا دەکرێت بڵێین کە ئەم برنجە ڕەقانە لای چینی هەژار و جووتیار و کۆچەریەکان زیاتر بە کار دەهێنرێت.

چاندنی خەشخاش لە چەند ساڵی لەمەوبەرەوە لە كرماشان پەرەی سەندووە. كەسێكی عەرەب كە سەرەتا وەک باخدار ناسرابوو و ئێستاكە میلیۆنێرە ئەم چاندنەی پەرە پێداوە. ئەمڕۆ ئەم كەسە عەرەبە چەند كارگەیەكی بنیاد ناوە و ڕۆژانە بڕێكی زۆر تریاک بۆ هێندوستان هەنارده دەكات.

بە داخەوە ئەمڕۆكە كوردەكان تەنیا بە چاندن واز لە خەشخاش ناهێنن و تەنانەت بەرەو بەكارهێنان واتا كێشانی كشاون. ئەم كەسە عەرەبە بۆ ناوچەكە بەڵایەكی مەترسیدارە. هەروەها ئەم كەسە بانكدارێكی نموونەییە! ناوبراو لە گشت ناوچەكانی ئێراندا لقی كردۆتەوە و سەرۆک خێڵەكانیشی بەرەو خۆی ڕاكێش كردووە. دەبێت ئەم ڕاستیە بدركێنم كە ئەو كەسە بۆ دەربازبوون لە ڕقی ئێرانیەكان خۆی وەک فەرمانبەری كۆنسوڵی بەریتانیا ناوزەد كردووە و لە ژێر ئەم چەترەدا كاری بازرگانی خۆی بەرەو پێش دەبات. لەگەڵ گشت ئەمانەدا كاتی ئەوە هاتووە كە لە تارانەوە بۆ بە گژ داچوونی ڕاستەقینەی ئەو مەترسیە واتا بەكارهێنانی تریاک كاری جیددی بكرێت. ئێستاكە زۆرێک لە خەڵكانی ناوچەی خوراسان ئالوودەی ئەم ژەهرە بوون. گەر بەم شێوەیە بەرەو پێش بچێت لە چەند ساڵی داهاتوودا زۆرێک لە ناوچەكان و خەڵكانی ئێران دەگرێتەوە.

لە كوردستانی كرماشاندا ڕاو بە شێوەیەكی بەرچاوبوونی هەیە. ڕاوی لەم ناوچەیەدا ورچ و گورگ و ڕێوی و بزنە كێوی و كەروێشک و كەو و لە وەرزی زستاندا قاز و مراوی و باڵندە كۆچەریەكانی‌تر لە مەترسی دەهاوێژێت.

بە نزیک بوونەوە لە بین‌النهرین لەگەڵ ئەوەدا كە سروشت و دار و ڕووەكەكان بەرەو گۆڕان دەچن لە هەمان كاتدا ئاژەڵەكانیش ڕەنگێكی‌تر بە خۆوە دەگرن. ئەوان لە لە ناو خۆڵ و خاشاک و هەندێ جار لە نزیک ڕووبارەكان ژیان بە سەر دەبەن.

کەوەکان له بین‌النهریندا دەسته به دەسته واتا به کۆمەڵ لـه ژێـر شـاخەکاندا و لـه داوێنەکاندا حەواونەتەوە. ژمارەیەکی زۆر ئاژەڵی‌تر لەم ناوچەیەدا بوونیـان هەیـه. هەروەها بەراز لێرەدا زۆره.

ئاژەڵان و بوونەوەرانی ئەم ناوچەیـە جیـاوازی تیایانـدا بـه بـەراورد لەگـەڵ ناوچەکانی‌تری ئێران به ڕوونی بەرچاو دەکەوێت. بۆ نموونه لێرەدا کۆلۆپێتر (باڵنده بچووکەکانی که دوو باڵی ڕەقیان هەیە)ەکان بوونیان هەیـه و هـەروەها لێپیدۆپێـتر (باڵنده بچووکەکانی که خاوەنی چوار باڵن)ەکان بەرچاو دەکەون که جیاواز لەوانی ناوچەکانی‌تری ئێرانن.

فیسـەکان کـه بوونەوەرێـک لـه بنەماڵـەی سـیفۆنۆفۆەکانن و جەسـتەیەکی سەرنج‌ڕاکێشی وەهایان هەیه که توانای خڕبوونەوەی زۆریان تیادایه و به ئاسـانی له سەر ئاو دەتوانن بووەسـتن، بۆیـه بەلەمیشـیان پێدەگوترێـت بـەرچاو دەکـەون. هەروەها لەم ناوچەیەدا پلانۆربەکان جێگەی خۆیان به مێـلانیەکان و هلیکسـەکان جێگەی خۆیان به بوولیمەکان داوه. واتا دەکرێت بڵێین که لێرەدا ژیانی ئاژەڵیش تا ڕادەیەک جیاواز له ناوچەکانی‌تره. له زەهاو مار و دووپشـک ژمارەیـان زۆره. بـه تایبەت لـه ئاسـەواری پاشـماوەی ساسـانیدا مـرۆڤ دەبێـت زۆر ئاگـادار بێـت. دووپشکەکان به ڕەنگی ڕەش و زەرد بوونیان هەیه. زەردەکان زۆر مەترسـیدارن و هەندێ جار درێژیەکەیان به ١١ تا ١٢ سانتیمەتر دەگات.

**دانیشتووان**

کوردستانی کرماشان نیشتمان و جێگەی نیشتەجێ بوونی عاشیرەتە کوردە کۆچەریەکانە. جگە لە دەشتەکانی کرماشان و مایدەشت کە ئێرانی تیادا نیشتەجێن ناوچەکانی‌تر شوێنی حەوانەوەی کوردانی ناوچەکەیە. شێوەزاری جیاواز لە ناوچەکەدا قسەیان پێدەکرێت کە بریتین لە: شێوەزاری لەکی کە لە گشت کوێستانەکانی کەناری ڕاستی ڕووباری گاماسیاو و ناوچەی کەلهوڕ قسەی پێدەکەن، شێوەزاری ڕەجەوی کە شێوەزاری خەڵکانی بیوەنیج و بەرزاییەکانی ڕەجەوە و شێوەزاری جاف کە کۆچەریەکانی نزیک سنوور تا ناو خاکی عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) قسەی پێدەکەن. ئەم شێوەزارانە زۆر لە یەکتر نزیکن. لەکی و جافی زۆر لە زاراوەی سنەیی نزیک دەبنەوە و ڕەجەوی زیاتر لە شێوەزاری هەورامانی دەچێت و لە زمانی ئێرانی زۆر دوور دەکەوێتەوە.

لە دەشتەکانی کرماشان و مایدەشتدا ئێرانی تیادایە کە پێدەچێت لە لایەن دەسەڵاتدارانەوە لە کاتی بنیادنانی کۆشکەکانی ساسانی لە نزیک تاق وەسان بۆ ئەم ناوچەیە هێنرابن. ئەم ئێرانیانە کە بە زمانێکی تێکەڵ لە زمانی ئێرانی و وشە کوردیەکان قسە دەکەن ژمارەیەکی زۆر گوندیان بنیاد ناون. ئەوان ناوچە تەخت و دەشتەکان بۆ کشتوکاڵ بەکار دەهێنن و لەم ڕووەوە سیمای ناوچەی کرماشانیان هێناوەتە گۆڕین.[1]

---

١- ژاک دمۆرگان: گوندی سۆیەرێزە یەکەم گوندە کە لە لای کرێن(کرند)ەوە و دوا بە دوای تێپەڕبوون لە چیای زاگرۆس پێی دەگەین. ئەم گوندە لە دۆڵێکی باریک و تەنگەبەر دایە کە بە دارستانەکان داپۆشراوە. کشتوکاڵ لەم گوندەدا کەمە و خەڵکانی گوند زیاتر بە فرۆشی کا و جۆ بە خەڵکانێک کە لێرەوە تێپەڕ دەبن و خۆراک بۆ ئاژەڵەکانیان دابین دەکەن ژیان بە سەر دەبەن. ئەمە تەنیا گوندێکە کە لە گشت ئەم کوێستانانەدا بوونی هەیە. لە دۆڵەکانی دەور و پشتدا کۆچەریەکان



شێوەی ٤٨- گوندی دێنوو و ئۆردووگای وەفلەمەکەمان

لە نێوان مایدەشت و بەرزاییەکانی زاگرۆسدا کوردەکان ژیان بە سەر دەبەن کە بە شێوازی نیشتەجێ بوو دەژین.

ئەوان نیشتەجێی گوندەکانن کە گوندەکانیان زۆر بە خراپی بنیاد نراون و کشتوکاڵی کەمیان هەیە. شوێنی هەڵکەوتەی شاری کرند (کرێن) کە شوێنێکی شاخاوییە زمانی کوردی تیایدا قسەی پێدەکرێت و تا رادەیەک تووشی گۆڕان هاتووە. لە کرند (کرێن) ئیتر بە زاراوەی لەکی قسە ناکرێت. بەڵکو بە تێکەڵەیەک لە دوو زاراوەی لەکی و ڕەجەوی دێتە ئاخافتن واتا تێواتێک لەم دوو زاراوەیە بە کار دەهێنرێت.

لە نزیک زەهاو گوندی زۆر هەیە و لە دەور و پشتی گشت ڕێگاکانی کە بەرەو عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) دەچن گوندی کوردەکان و دانیشتووانی کورد بەرچاو

---

دەحەوێتەوە کە لە مرۆڤە سەرەتاییەکان دەچن کە هەرگیز لەگەڵ دەرەکیەکاندا پێوەندیان نەبووە (نووسینەکانی ٢٣ی فێوریەی ١٨٩١ی ژاک دەمۆرگان).

دەکەون.



شێوەی ٤٩- گوندی حەوش کوری و ئۆردووگای وەفدەکەمان.

له باکووری ڕۆژئاوای زەهاو، لـه سـنووردا جافـەکان بوونیـدا هەیـه کـه بـه شێوەزارێکی تایبەت قسه دەکەن. ئـەوان ژیـانی کۆچـەریان هەیـه و جلوبـەرگی هاوسێکانیان واتا جلوبەرگی عەرەبەکان له بەر دەکەن.[٢]

---

١- کرێن(کرند) شارێکی بچووکه که له بەرزایی ١٥٤٥ مەتری ئاستی ڕووی دەریاوە هەڵکەوتووە. ئەم شارە ٨٠٠ خانوو و سێ هەزار کەس دانیشتووانی له خۆ گرتـووە کـە زۆربـەیان جووتیـارن. ئەوانە لەم کوردانەن که باوەڕی عەلیوڵڵاهی یان هەیە. ئەوان به زاراوەیەکی نزیـک بـه ڕەجـەوی دەدوێن. کرێن(کرند) له نزیک فالزێکی نزیک به ستوونیەوە هەڵـکەوتووە کـه پێـکهاتەی کلـسی هەیە. بەشێکی له ناو پێکهاتەیەکی شاخاویدا و بەشێکی‌تری له داوێـنی چیـادا هەڵـکەوتووە. لـه نزیک کرێن(کرند) پۆسته و تێلیگراف و کاروانـسەرا و جۆرەکانی جیاوازی باغ بـەرچاو دەکـەون. ڕێگای گاوارە له کرێن(کرند) تێپەڕ دەبێت و شوێن بەرزاییەکان دەکەوێت. ئەمە کورتە ڕێـگایەکی زۆر خراپە (نووسینەکانی ٢٢ی فێوریەی ١٨٩١ی ژاک دمۆرگان).

٢- گوندی قورەتو چەند ساڵێکه به فەرمانی عەزیزخان سەرۆکی کوردەوە له کـەناری ڕووبـاری زەهاو بنیاد نراوە. عەزیزخان به ڕەگەز تورک بـووە. ماوەیـەک سـەرۆک خێڵـی کۆچـەریـەکانی باجەلان (جاف) و مێژووی ڕێگریشی هەبووە. دوازدە ساڵ لەمەوبەر سوڵـتانی ئێـرانی(عەجـەم) ناوبراوی بۆ نیسفەهان هێناوە و پێشنیاری ئاگاداری سنووری پێداوە. تا ئـەو کـات ناوچەکـه زۆر جار له لایەن ڕێگر و هەندێ جاریش له لایەن باجەلانیەکانەوە وێران دەکرا. سوڵتان ڕووبەرێکی

له باشووری مایدەشت و زەهاو کۆچەریە کەلهوڕەکان دەحاوێنەوە. شێوە زاری ئەوان لەکی و ئەم شێوەزارە له دۆڵی ڕووباری گاماسیاو تا پشتکۆ و سنووری لوڕستان درێژ دەبێتەوە.[1]

دانیشتوانی ئەم ناوچانە گشت موسڵمان و شیعەن. کرند (کرێن) و زەهاو هاوسێی موسڵمانە سونیەکانن و ژمارەیەکی زۆر له دانیشتووانی ئەم دوو شارە لە سەر بیروڕای عەلیوڵڵایین.

بەڵام له بارەی مەسیحیەکانەوە دەبێت بڵێم که له گشت ئەم ناوچانەدا تەنانەت یەک کەسی مەسیحی بوونی نییە.

---

زۆری زەوی نێوان ڕووبارەکانی حەلوان و دیالەی لەگەڵ بڕە پارەی ساڵانەی ٦ تمەن (٤٨٠ فرانک)دا به ناوبراودا و هەر وەها عەزیزخانی به پلەی سەرتیپی وەرگرت. لەم کاتەدا عەزیزخان ئەم کەس و خێڵانەی ترس و دوودڵی لێیان هەبوون بەرەو ناو خاکی عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) دوور کردنەوە و بۆ حەوانەوەی کەسانی نزیکی خۆی و سوارکارانی گوندی قورەتۆی بنیاد ناوە. دواتر له ناوچەی نزیکتر به سنوور گوندێکی‌تری بنیاد نا و کورەکان و کەسوکاری خۆی تیادا نیشتەجێ کرد. ئەمڕۆکە سنووری ئێران بەم هۆیەوە زۆر سەقامگیر و ئارامە. چونکە ئەم پارێزەرە سنوورە له بەرامبەر عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ)دا ڕۆڵی ڕێگر دەگێڕێت و کەسێک که به ڕێگری گەورە بووبێت زیاتر بەرەو سنووری هاوسێکەی دەچێت و له ناو سنووری ئەودا چالاکی خۆی دەنوێنێت (نووسینەکان ١٠مارسی ١٨٩١ی ژاک دەمۆرگان).

١- له بارەی کۆچەریەکانی هەلێران و باڵەوەن (باڵەن) دەبێت بڵێم که ئەوان تێکەڵەیەک له کورد و لوڕەکانن. ئەوان له هەژاری و فەقیریدا ژیان به سەر دەبەن. لەم ڕوانگەوە که ئەم دۆڵ و دەشتانە له حکومەتی ناوەندیەوە زۆر دوورن ئەوا ئەم خەڵکانە به شێوازی سەربەخۆیی ژیان به سەر دەبەن. زۆرێک لەم خەڵکانە ئەو یاغیانەن که له حکومەتەکانی هاوسێ ڕایان کردووە و لێرەدا لە ژێر خێوەت و چادرەکاندا دەژین. ئەوان کەمتر کشتوکاڵ دەکەن و زیاتر نانی بەرووی شیرین و بەر و بوومی دەستکەوتوو له ئاژەڵەکانیان بژێوی ژیانیان دابین دەکات. ئەوان ڕێگرانێکی ترسناکن و سەلامەتی ئێمە تەنیا به بوونی سیلاحەکانمان مسۆگەر بوو. چەند مانگ لەمەوبەر که دوو کەسی پشتکۆ ویستوویانە له ناوچەی ئەوان تێپەڕبن و بۆ کرماشان بچن له لایەن ئەو ڕێگرانەوە هاتوونە کوشتن (نووسیەکانی ٢٨ئابریلی ١٨٩١ی ژاک دەمۆرگان).

**شار و گوندەکان**

کوردستانی کرماشان لەم ڕوانگەوە کە ئاسەواری بینا کۆنەکانی تیادایە لە ئێراندا گرنگی تایبەتی هەیە و لە ڕاستیدا کرماشان و شووش و شیراز لەم ڕوانگـەوە وەک یەک گرنگی دەنوێنن.

هەرچەندە کە دەبوایە من لە بەرگێکی تایبەتدا باس لەم ئاسـەوارە مێـژووییانە بکەم، بەڵام لە باسێکی تەسەلدا ئەم باسە لە ڕۆژهەڵاتەوە بـەرەو ڕۆژئـاوا دەخەمـە ڕوو. لە چەند فەرسەنگی کەنگەڤەر لە نێوان کوێسـتانەکانی کوردسـتاندا دۆڵێـکی بەرفران هەیە کە بە دینەوەر ناسراوە. لەم دۆڵە بەرفراوانەدا لـە کۆنـدا شارێـک بـە ناوی دینەوەر بوونی هەبووە. بـەڵام ئەمڕۆکـە تـەنیا گوندێـکی کـەم بایـەخی لـێ ماوەتەوە. بە پێی نووسینەکانی یاقووت (معجم‌البلدان) پانتایی دینەوەر یەک لە سەر سێی هەمەدان بووە. ئەم شارە بە باخەکانی میـوە و کشتوکاڵـی چـالاک دەور دراو بووە و لە ناوچەیەکی جوان و ڕازاوە و پڕ ئاودا هەڵکەوتووە. ئـەم شـارە ساحێـبی چەندین زانای گەورەی ئیسلامی بووە کە نموونەی ئـەوان عبـدالله وهـب‌الحـافزە. هەروەها لەم شارەدا بازاڕێکی گەرم و شوێنی حەوانـەوەی میـوان هـەبووە. بـەڵام ئەمڕۆکە دینەوەر یا هەمان دینەوەر ئاسەوارێکی وەهای لێنەماوەتەوە و بە گشتی لە ناو چووە. ئێستاکە ئیتر دینەوەر تەنیا بە مانای شوێنی حەوانەوەی کۆمەڵێک کـورد -ێ گرنگی ئەوتۆ- بە کار دێت. باخەکان ئاسەواریان لێ بڕاوە و کشتوکاڵ پـاش گوێ خراوە. ئیتر ناوی شارێکی بە جوانی شاری دینەوەر بۆ ئـەم شوێـنە بـە کـار نایەت. لـە نێـوان گونـدەکانی زیواجـوو و شێـخان ئاسـەواری دینـەوەر بـەرچاو دەکەوێت. زەویەکانی ئەم بەشە تەواو ئاسۆیین و خەڵکانی ناوچەکە بۆ دۆزینەوەی شتومەکی گرانبەها چەند شوێنێکیان هەڵکەندوون. لەم شوێنەدا چەنـد سـکەیەکی سەردەمی هەخامەنەشی تا سەردەمی دەسەڵاتی عەرەبـەکان دۆزراوەتـەوە، لەگـەڵ

بڕێک زێڕ. کوردەکان ئەو شتومەکانە کە بە دەستیان دەهێنن لەگەڵ خان واتا سەرۆکی خۆیاندا بەشی دەکەن. بەڵام لەم ڕوانگەوە کە ئەم هەڵکەندن و دۆزینەوانە بێ ئیزنی حکومەتن بۆیە زۆر جێی باوەڕ و متمانە نین و من بۆ دیاریکردنی مێژووی ئەم ئاسەوارانە نەمتوانی جگە لە چەند وردە کەلوپەلێک شتێکی تر بە دەست بخەم. ئەو سکانە کە باسم لێوە کردن لە هەمەدان پێشانم دران. ئەوان منیان دڵنیا کرد کە ئەو سکانە لە شوێنی دینەوەر دۆزراونەتەوە، بەڵام من نەمتوانی ڕاستی ئەو وردەکاریانە کە بە من دران بیانسەلمێنم.



شێوەی ٥٠-شوێنی شاری دینەوەر.

هەرچی بێت ئەمە ڕوون و سەلماوە کە دینەوەر لە ڕابردوودا شارێکی گرنگ و گەورە و پڕحەشیمەت بووە.

بە تێپەڕبوون لە دیناوە بە تەنگەبەرێک دەگەین کە ئێمە بە زەویە کراوەکانی گاماسیاو دەگەیەنێت. لێرەدا بە هۆی کرداری ئاوەوە شاخەکان شێوازی چەندین

دەندووکی تیژیان وەرگرتووە. و هەر لێرەدا ئاسەواری ڕێگایەک کە بە دەستی مرۆڤ هاتۆتە دروست کردن دەبینرێت.

لە نزیک بێستوونە کە ئاوی ڕووباری دینەوەر بە ڕووباری گاماسیاو دەگات. کەمێک لە سەرووی ئەم بەشەدا و لە کەناری چەپی ڕووبارەکە شوێنێک بە ناوی تەختی شیرین هەیە کە تیایدا تەپۆڵکەکان ئاسەواری چەند کۆشکێکیان لە خۆ گرتووە کە پێدەچێت هی سەردەمی ساسانی بن.



شێوەی ٥١- ئاشبەردەکانی بێستوون.

بێستوون گوندێکی بچووکە کە لە نزیک شاخی مەزنی بێستوونی ستوونیدا کێوی پەڕاودا هەڵکەوتووە. لە سەر ئەم شاخەیە کە داریووش باسی داگیرکردنەکانی خۆی وێنا کردووە و بیرەوەریەکانی خۆی هەڵکەندووە و لە

سه‌رده‌می ئێمه‌شدا پاشایه‌کی ئێرانی ناوی خۆی پێوه زیندە کـردووه. نووسـراوه‌کانی هه‌خامه‌نه‌شی زۆر دوور و درێـژ و بـۆ بواره‌کـانی جوگرافیـا و مێـژوو هه‌ڵـگری چه‌ندین به‌ڵگه‌ی گرنگن که به‌م وشانه ده‌ست پێده‌که‌ن:

منم داریووش، پاشای گه‌وره، پاشای شایه‌کان، پاشای پارس، پاشای وڵاتـان و کوڕی ویشتاسب و نه‌وه‌ی ئه‌رشام، هه‌خامه‌نه‌شی.

پاشا داریووش ده‌ڵێت: من کوڕی ویشتاسبم و باوکی ویشتاسب ئه‌رشام بـووه و باوکی ئه‌رشام ئاریامنه و باوکی ئاریامنه چیش‌پیش بووه و بـاوکی چـیش‌پـیش هه‌خامه‌نه‌ش بووه.

پاشا داریووش ده‌ڵێت: ئێمه له کۆنه‌وه ناوبانگمان هـه‌بووه و پاشـابوونمان لـه کۆنه‌وه بۆ ماوه‌ته‌وه.

پاشا داریووش ده‌ڵێت: هه‌شت پشتی پێشووی من پاشا بوون و مـن نۆهـه‌مین پاشا له بنه‌ماڵه‌که‌مدام، ئێمه له دوو سه‌رده‌مدا پاشا بووین.[1]

پاشا داریووش ده‌ڵێـت: مـن بـه خواسـتی ئه‌هوورامـه‌زدا بـووم بـه پاشـا و ئه‌هوورامه‌زدا پاشایه‌تی به من به‌خشی.

پاشا داریووش ده‌ڵێت: به‌ڵێ له‌و وڵاتانه‌دا که من پاشـام ئه‌مـه ئه‌هوورامـه‌زدا منی به‌م پله‌یه گه‌یاندووه. به خواستی ئه‌هوورامه‌زدایه کـه مـن لـه سـه‌ر پـارس و خووزیان و بابلی و ئاسوور و عه‌ره‌بستان (مـودرای) و وڵاتـانی نـاو ئـاوی وه‌ک ئسپرد (سارد)یۆن و ماد و ئه‌رمه‌نستان و کاپادۆکیه و پارت و زرنـگ و هـه‌رات و خاره‌زم و باخته‌ر و سه‌غد و قه‌نـدهار و سـرمین و سـتاگوش و ڕه‌خـج و ماسـی

---

١- سه‌ره‌تا شه‌ش پاشا و دواهه‌مینیان هه‌خامه‌نه‌ش، پێش ده‌سه‌ڵاتی فرائـۆرتس تـا ٦٥٠ ساڵـی پێش زایین. دواتر سه‌ر له نوێ له کووروشه‌وه (ج. اوپرت، نه‌ته‌وه و زمانی ماده‌کان، لاپـه‌ڕه‌ی١١٣، نووسینی١).

(مەککە) کە لە سەر یەک ٢٣ وڵات لە خۆ دەگرێت پاشایەتی دەکەم. دوای ئەم وتانە باسێکی وردی چالاکیە گرنگەکانی حکومەتی داریووش دێت.

ئەم نووسینانە کە لە نووسینەکانی هەخامەنەشی کە بۆ ئێمە جێماون بە سێ زمانی مادی و پارسی و ئاسووری تۆمار کراون. ئەم نووسینانە لە دۆزینەوەی سڕەکانی نووسینە مێخیەکاندا ڕۆڵی گرنگیان هەبووە.

لە مەغریب کەتیبەی داریووش واتا تاشەبەردی گەورە ئامادە کراوە، بەڵام کارەکانی بە کۆتایی نەگەیشتوون و هیچ نووسراوێک لە سەری هەڵنەکەندراوە.

ئەو کاروانانە کە لە بەغدادەوە بەرەو ئێران دێن گشتیان لە بەردەم تاشە بەردەکەی بێستوون تێپەڕ دەبن و بەم هۆیەشەوە شاعەباس بۆ ئەم کاروانانە لەم شوێنەدا کاروانسەرایەکی ڕازاوەی بنیاد ناوە.

ئەم تاشەبەردە کە لای ئێرانیەکان بە بۆغستان و لای یۆنانیان بە بغیستانوون ناسراوە. جگە لە ئێرانیەکان سەرنجی عەرەبەکانیشی بەرەو لای خۆی ڕاکێش کردووە. ئەوان ئەم کەڤرە بە بێستوون (بێ‌ستوون) یا بەهستوون ناو دەبەن و ئەمە ناوێکە کە زیاتر بۆی بە کار دەهێنرێت. خەڵکانی ناوچەکە ئەم سیما و شێوانە کە لە سەر ئەم کەڤرانەدا هەڵکەندراون بۆ ڕووداوە ئەفسانەییەکانی خۆیانیان دەگەڕێننەوە. یاقووت نووسیویەتی کە:

«لە خواارووی ئەم شوێنە لە سەر کەڤرێکی سافدا شوێنی هەڵکەندراوی ئانشکێک بەرچاو دەکەوێت° کە ڕوونە ئەمە کار و شوێن دەستی مرۆڤە. ڕوون و بەرچاوە کە یەکێک لە پاشاکانی ئێرانی بە مەبەستی دەرخستن و سەلماندنی گەورەیی و هێزی خۆی خوازیاری بنیادنانی بازاڕێکی گەورە لە دەوری چیا بووە.»

بەڵام ئەمە پێناچێت زیاتر لە خەیاڵێک شتێکی تر بێت کە لای نووسەری عەرەب خۆی نواندووە. چونکە ئەمە تەنیا ئامادەکاری بۆ کەڤرێکی گەورەیە و هیچی تر. بەڵام ئەگەری ئەمەش هەیە کە لە نزیک ئەم سەرچاوە ئاوە ڕوونەی کە لە تاشە بەردەکەوە دەرژێتە دەرەوە بینا و دامەزراوەی لێ بووبێت، بەڵام ئەمڕۆکە شتێک جگە لە چەند پێکهاتەی وردبووی بێناونیشان شتێکی تر بەرچاو ناکەوێت.

لە بەرزاییەکانی هەڵکەوتووی کەناری چەپی ڕووباری گاماسیاو و لە بەرامبەر کەڤری بێستووندا چەند گۆڕێکی سەردەمی هەخامەنشی بەرچاو دەکەون. سەرنجڕاکێشترینی ئەم گۆڕانە گۆڕی دیتوویە. ئەم گۆڕانە پێش من لە ئەورووپاوە سەردانکەریان بۆ نەهاتووە. لە ڕۆژئاوای ئەم بەرزاییانەدا و لە دۆڵێکی زۆر کراوەدا (کە شێوازی دەشتی لە خۆ گرتووە و زیاتر لە دەشت دەچێت تا دۆڵ) شاری کرماشان هەڵکەوتووە کە بە گرنگترین شاری کوردستان دەناسرێت. ئەم شارە لە سەر دواشەپۆلەکانی بەرزاییەکانی چیاسپی هەڵکەوتووە و بە شێوەی ئامفیتیاتر بنیاد نراوە.



شێوەی ٥٢- کرماشان

نووسەرە عەرەبەکان کرماشانیان بە قرمیسین ناو بردووە. ئیزیدۆر دۆکارکس کرماشانی بە کامبادینە(Kambadene) ناو هێناوە. ئەم ناوەی دوایی کە بە کار هاتووە بۆ شاری ئەمڕۆی کرماشان نەبووە، بەڵکو بۆ ئاسەواری جێماو و کەلاوەکانی چەند کیلۆمەتری باکووری کرماشان بە کار هاتووە کە من پێیان گەیشتم و بینیمن.

عەلی‌میرزا کوڕی فەتحەعلیشا کارگەی دروستکردنی سیلاحی لە کرماشان بنیاد ناوە و بەم هۆیەشەوە کرماشان پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆوە بینیوە. شارەزایانێک لە گشت نەتەوەکان لەم شوێنەدا خەریک بە ئیشن کە نموونەی ئەوان کێلنێل‌رالینسە کە لەم سەدەیەدا ڕۆڵی گرنگی لە دۆزینەوە مێژووییەکاندا وەک شارەزای ئەم بوارە هەبووە. لەم کاتە بە دواوە هەر ڕۆژێک گرنگی شار کەمتر بۆتەوە و بازاڕ پەشێو بووە. جگە لە کۆشک و باخەکانی پاشاکان شتێکی‌تر و بینای‌تری سەرنج‌ڕاکێش تیایدا بەرچاو ناکەون.

بەڵام گەر کرماشان بۆ سەردانکەرێکیش سەرنج‌ڕاکێش نەبێت ئەوا لە ڕووی مێژووییەوە کامبادانە و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆی ئێمەدا تاق وسان یا تەختی وسان وەها نییە. لەوێدا لە نزیک سەرچاوەیەکی پڕ ئاوی ڕوون لە کەفرێکدا هۆڵ هەڵکەندراوە کە لە ڕابردوودا تەنیا وەک شوێنێکی مێژوویی نەبووە. ئەم دوو هۆڵە کە سەرداپۆشراو بە هۆی کەفرەکەوەن لە ڕووی بەرزیەوە نایەکسانن. هۆڵە بەرز و گەورەترەکە زۆر لە هۆڵەکەی‌تر ڕازاوەترە. هەڵکەندراویەکانی ناو هۆڵەکان زۆر ورد و جوان و سەرنج‌ڕاکێشن. هۆڵە بچووکەکە تەنیا دوو پیاو لە خۆ دەگرێت و چەندین نووسراى بە زمانی پەهلەوی تیادا بەرچاو دەکەوێت. لە ڕۆژهەڵاتی ئەم دوو هۆڵە وێنەیەکی هەڵکەندراوی گەورە هەیە.

گشت ئەم سیمایانە بۆ سەردەمی ساسانی دەگەڕێتەوە.



شێوەی ٥٣- کرماشان، کۆشکی حاکم

لە دەرەوەی هۆڵە گەورەکەدا تاشە بەردێکی ڕازاوە بەرچاو دەکەوێت و لە بەشی چەماوەی سەقفەکەدا دوو فاتح بەرچاو دەکەون کە تاجێکیان بە دەستەوەیە.

دیواری خوارەوە تێکەڵەیەک لە دوو چین و ئاستە. ئاستی یەکەم هەڵگری وێنەی سوارکارێکە کە نێزە و قەڵغانی هەڵگرتووە. لە وێنەکەدا دیارە کە سوارکارەکە جلوبەرگی زرەهی (دژە نێزە)ی لە بەردایە. و ئاستی دووەم واتا وێنەی دووەم سێ پیاو لە خۆ دەگرێت کە ناوەڕاستیەکە پاشایە و بە جلوبەرگی قوماشی حاشیەدارەوە دەرکەوتووە کە پاڵی داوەتەوە.

دەور و پشتی بینایەکە بە وێنە هەڵکەندراوەکان ڕازاوەتەوە کە وێنەی ڕاو پێشان دەدەن. لە بەشی ڕۆژئاوا واتا لە لای چەپ وێنەیەک هەڵکەندراوە کە پیشاندەری پاشایە کە بە نێزەکانی خۆی بەرازێک کونکون دەکات، لەملاتریشەوە

فیلەکان کۆ بوونەتەوە و ئافرەتان پێشان دراون کە بە جەستەی ڕووت و بە جلوبەرگەوە خەریک بە مۆسیقاژەنینن.

لە لای ڕاستی ئەم وێنانە نۆکەرەکان پێشان دراون کە نێچیرەکەیان پارچەپارچە دەکەن.

بەرمو لای ڕاست وێنەیەکی تری هەڵکەندراو هەیە کە بە داخەوە ناتەواو ماوەتەوە و تیایدا وێنەی ئاسکێکی کێوی بەرچاو دەکەوێت کە ڕاو کراوە و لەم ڕاوەدا پاشا حزووری هەیە و ئافرەتان لەملاوە لە سەر کورسیەک دانیشتوون.



شێوەی ٥٤- هەڵکەندراوەکانی تاق وەسان

هەر وەک باسمان لێوە کرد ئەیوان لە ڕووی ئەم جۆرە ئاسەوارە هەڵکەندراوانە گرنگی زۆر کەمتری هەیە. بەشی سەرووی ئاستی یەکەم یا هەمان وێنای خواروو دوو پیاوی لە خۆ گرتوون. نووسراوەکانی کە تیایدان بەم شێوەیەی خواروون:

ئەم کەسەی کە لە خوارووداوێنەکەی هاتووە پەرستیاری ئەهوورامەزدا شاپووری گەورەیە. پاشای پاشاکانی ئێران و ئێردراوی ئاسمان و لە ڕەگەزی خوداکان، کوڕی پەرستیاری ئورمێزۆ، ئەهوورامەزدای گەورە پاشای پاشاکانی ئێران و لە ڕەگەزی خواکان نەوەی ئێرسسی مەزن پاشای پاشاکانە (بگەڕێوە بۆ: سیلۆستێر دوساسی، نووسیەکانی لە بارەی سەردەمی باستانی ئێرانی، پاریش ۱۷۹۳، ل۲٤۳).



شێوەی ٥٥- کڵاوی پاشا، وێنە کراو لە ڕووی هەڵکەندراوەکانی تاق وەسان

ئەم کەسەی کە لە خوارەوەدا وێنەکەی هاتووە پەرستیاری بەهرامی مەزن و پاشای پاشاکانی ئێران و لە ڕەگەزی خوداکانە. شاشاپووری مەزن پاشای پاشاکانی ئێران لە ڕەگەزی خوداکان و نەوەی هۆرمەزدی گەورە پاشای پاشاکانە (بگەڕێوە بۆ: سیلۆستێر دوساسی، نووسیەکانی لە بارەی سەردەمی باستانی ئێرانی، پاریش ۱۷۹۳، ل ۲۵۵).

وەک بینیمان ئەم ئاسەوارانە بە فەرمانی بەهرام کوڕی دووەمی شاپوور، کوڕی هۆرمەزد، کوڕی نێرسس بنیاد نراون.

لە یەکێک لە وێنەکاندا پاشا وێنا کراوە کە پێ لە سەر جەستەی ئەسیرێکدا دادەنێت. پێشووتر سەرچاوەی تاق وەسان بە دۆڵەکەدا ڕێی کردووە. بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا وکیل‌الدوله بە مەبەستی ئاودێری زەویەکان چەندین بەربەست و بەنداوی لە سەر ڕێگەی ئەم ئاوەدا هێناوەتە کایە. بە هەی ئەم کارەوە دوو تا سێ ستوون دۆزراونەتەوە کە بە ڕای من لە ڕوانگەی میعماری ساسانیەوە گرنگی زۆریان هەیە.

لە نێوان تاق وەسان و شاری ئەمڕۆی کرماشاندا ژمارەیەکی زۆر کەلاوە و پاشماوەی شاری کامبادانە بەرچاو دەکەون. تا ئێستا هیچ لێکۆڵینەوە و پشکنینێکی زانستی لەم ڕووەوە بۆ ئەم شوێنە بە ئەنجام نەگەیشتووە. بەڵام خەڵکانی ناوچەکە زۆر جار لە کاتی چالاکیە کشتوکاڵیەکاندا بە سکەی سەردەمی ساسانی دەگەن.

کەمێک لەولاترەوە کاتێک لێژی بەرەو دەشتی کەلدە دەست پێدەکات ئاسەواری‌تری ساسانی بەرچاو دەگەون کە بە تەخت‌گەرا ناسراوە. ئەمانە لە ڕووی هەمان وێنەکانی تاق وەسان دروست کراون، بەڵام بە جێگەی ئەوەی کە لە سەر تاشە بەرد هەڵبکەندرێن ئەوانە لە سەر بەردە تاشراوەکان دروست کراون. پێشووتر

ئەم ئاسەوارانە لە سەر ڕێگە هەڵکەوتبوون، بەڵام ئەمڕۆکە شوێنی ڕێگە و جادەکە گۆڕاوە و بەم هۆیەوە تەختەگەرا لە شوێنێکی دوورەدەستدا ماوەتەوە.

ڕێگە کۆنەکە کە هێشتا ئاسەواری ماوەتەوە بە پێکهاتە مەرمەڕیەکانی داوێـنی چیادا تێپەڕ بووە. بۆ بەشی دەرەوەی جادەکە لە زۆر شوێندا کەڵک لە دیواری بەرد و گەچی وەرگیراوە. ئەم کارە سەرنجڕاکێشە ئەمڕۆ وێران بووە. ئەم ئاسارە هـەرگیز پارێزگاری لێنەکراوە و کاتێک پاشا بۆ زیارەتی کەربەلا چووە ڕێگەی نوێ لێدراوە و ئەم ڕێگەیە لە بیر کراوە. ئەم ڕێگە نوێیە زۆر کەمتر لە ڕێگە کۆنەکە کە پاشاکانی ساسانی گرنگیان پێدابوو قابیلی هاتوچۆن.

زەهاو کە لە داوێنی زاگرۆسدا هەڵکەوتووە ئاسەواری مێژوویی زۆری لە خـۆ گرتووە. زەهاو دوو شار یا خود باشترە بڵێین دوو گوندی گەورە لە خـۆ دەگرێـت. یەکێک سەرپۆل و ئەوەی تریـان قەسـری‌شـیرین. ئـەم دوو شوێـنە وەک شوێـنی حەسانەوەی کاروانەکانی نێوام بەغداد و کرماشان ناسراون.



شێوەی ٥٦- هەڵکەندراوایی و نووسراوەکانی تاق وەسان



شێوەی٥٧- حاكمەكانی كرند (كرێن) و گاوارە

ناوی سەرپێڵ لەمەوە هاتووە كە لەم شارەدا پردێك لە سەر ڕووباری هەڵوان دروست كراوە و شوێنی خەلمانی مێژوویی تیادا هەڵكەوتووە. دوو كەناری ڕووبارەكە چەند ئاسەوارێكی لێ ماوەتەوە كە پێدەچێت پاشماوەی كۆشك و یان هی قەڵاكانی سەردەمی ساسانی بێت. سەرپێڵ لە سەردەمانی زۆر كۆنەوە وەك شوێنی نیشتەجی بوون بوونی هەبووە. من لە سەرپێڵ تاشە بەردێكی گرنگی مێژوویی پاشا ئەنوبانیم دۆزیەوە. ئەم تاشەبەردە یەكێك لە مێژووییترین ئاسەوارێكە كە من لە ئاسیا بینیبێتم (بگەڕێوە بۆ: تاشە بەردێك لە زەهاو، ژ. دمۆرگان و و. شیل، كۆمەڵە كاری زمانناسی و مێژووناسی میسر و ئاسووری، ل ١٠١).[1]

---

١- ژاك دمۆرگان: لە بارەی تاشەبەردی مێژوویی پاشا ئەنوبانی دەبێت بڵێم كە لەم بارەوە لە كتێبی كۆمەڵە كاری زمانناسی و مێژووناسی میسر و ئاسۆریدا كە ناومان هێنا نووسراوە: «یەك نستامپاژ (چاپ لە سەر مس یا دار) لەم تاشەبەردە لە لایەن سەروان «لتۆن برژ»ەوە كە كەسێكی



شێوەی ٥٨-نیوەڕۆ (پرۆفیل)ی جادەی مێژوویی تەخت‌گەرا

ئەم تاشەبەردە نزیک بە سی مەتری بەرزتر لە ئاستی دەشتەکە هەڵکەندراوە و

نیزامی فەرەنسا لە سەفارەتی قوستەنتەنیەیە بۆ ڕێزدار هۆزی ناردراوە و ناوبراو ئەمەی لە ئیختیار ئەکادیمیەکانی نووسین و ئەدەبیات هاویشتووە» (ڕاپۆرتەکانی دانیشتنەکانی ساڵی ١٨٩١، ل ١٢٠، دانیشتنەکانی ١٧ی ئاپریل). من لەم کاتەدا نموونەیەکی وێناکراوی ژەنەڕاڵ ڕالینسن کە براکەی لە پێنج زنجیرەی گەورەی پاشایەتی (چاپی دووەم، بەرگی سێهەم، ل ٧)دا چاپی کردبوو لە دەستمان دابوو، بەڵام ئێمە ڕواڵەتی ئیلاهەی ئیستارمان نەدەناسی. وێناکردنەکانی سەروان بیرژە لە ژمارەی داهاتووی گۆڤاری ئاسۆرۆلۆژیدا بە چاپ دەگەن. بە پێی پێشنیاری بەڕێز کساویە شارم، ڕێزدار هێربێرت ئستامپاژی ئاغای مۆرگانی لە چوارچێوە گرتووە و لە مۆزەخانەی ئاسووری لوور پارێزگاری لێدەکرێت.»

ئەم نووسینە هەڵەی تیادایە. ئەم زانیاریانە کە من لە کاتی سەفەرەکەمدا بۆ ڕێزدار ژ. ماسپرۆ ناردوومە ناوبراوی لە هەڵە هاویشتووە. تاشەبەردێک کە سەروان برژە ئستامپاژەکەی بۆ ڕێزدار هۆزی ناردووە هی هۆرین شێخ‌خانە کە لە لاپەڕە پێنجی نووسینەکانی «و. شیل»دا هاتووە و لە لایەن خۆمەوە وەرگێڕدراوە. بەڵام لە بارەی وێناکردنەکانی ژەنەڕاڵ ڕالینسەوە کە لە پێنج زنجیرەی گەورەی پاشایەتیدا بە چاپ گەیشتوون هی بەشی خوارەوەی کەفرەکانی سەرپیەڵن و بە ڕادەیەک ناکامڵە کە کەسێک بە زەحمەت لێی تێدەگات. نووسراوێک کە هەیە و من تۆمارم کردووە و هەروەها بەڵگەکانی هۆرین شێخ‌خان لە پێش سەفەری مندا چاپ و بڵاو نەکرابوونەوە.

لەم تاشەبەردەدا پاشا ئانوبانی بەرچاو دەکەوێت کە پێی خۆی لـە سـەر جەسـتەی ئەسیرێکدا داناوە و ئیلاهە نی‌نی دوو ئەسیری لە بەر دەستدایە کە یەکێکیانی زەنجیر لە دەم کردووە. ئەم تاشەبەردە بۆ سێ هێڵی ئاسۆیی و بیست و دوو هێڵی سـتوونی دابەش دەبێت کە بە داخەوە کامڵ نین. چونکە بە هۆی کـرداری دابـارین پێـکهاتە مەڕمەڕیەکە گۆڕانی بە سەردا هاتووە و دێڕی خوارەوەی بە تەواوی لە ناو چووە.

من بۆ دەست پێگەیشتنم بە نووسراوە هەڵـکەندراوەکان و بینینیـان ناچـار بـە دروست کردنی قادرمەیەکی گەورە بووم کە بە کەڵک وەرگرتن لەم قادرمەیە توانیم بـۆ لایـان بچـم و ئسـتامپاژ (لـە ڕوو گرتنـەوە)یـک لێـیان بـە دەسـت بخـەم و وردەکاریەکانی ئەو وێنانە کە بە دەستم گەیشتبوون تاوتوێ بکەم.

نووسراوەکان باس لەوە دەکەن کە:

ئانوبانی پاشای بە توانا، پاشای لۆلۆبی(ک.ئیم)، وێنەی پاشای ناوبراو و ئیلاهە نی‌نی لە چیای باتیر (پادیر یا پاتیر) لە سەر تاشە بەردەکان هاتووە. هـەر کەسێـک کە ئەم تاشانە هەڵبگرێت ئانوم و ئاتات و ئێنکیت و بێلکیت و ئـەدەد و نـی‌نـی و سین و ساماس و...... و...... کە نین ....... و....... کە لە ئـەو....... مەرگەکـەی و..... نەعلەتەکەی ڕادەگەیەنن، و منداڵەکانی بە نەعلەت دەکەن کـە. [پێدەچێـت شوێـنە جێماوەکان بە هۆی لەناوچوون و خرابوونیان قابیلی خوێندنەوە و تێگەیشـتن لای دمۆرگان نەبووبن. (وەرگێڕان)]

وەک دەبینین ئەم نووسراوە لە ڕووی جـوگرافی و مێـژووییەوە گرنگـی زۆری هەیـە، چونکـە چەنـدین نـاو کـە هێشـتا لای ئێـمە نەناسـراو و نادیـارن بۆمـان

دەدرکێنێت.[1]

له سەردەمی ئەنوبانی پاشای سامیدا واتا نزیک به شەست سەده لـه پێشـووی ئێمەدا سەرپێل شار بووه و کەوابوو گەر ئێستاکەش هەڵکەندنی زانستی به ئـەنجام بگەن له ژێر تەپۆڵکەکاندا و له ژێر کەلاوەکانی ساسانیدا ناسـەواری ئـەم مێـژووه کۆنه بەردەست دەکەوێت.

له دەور و پشتی سەرپێل هێشتا نووسـراو و تاشـەبەرد و کـەلاوەکان بـەرچاو دەکەون. من له بەرگێکی تایبەت به مێژووناسیدا ئەم لایەنانه باشتر شی دەکەمـەوه. بەڵام بەر له جێهێشتنی ئەم شوێنه دەبێت باسێکی کورت له بـارەی گـۆڕی داوود که هی سەردەمی هەخامەنەشـییه و لـه سـێ کیلۆمـەتری باشـووری ڕۆژهـەڵاتی سەرپێل هەڵکەوتووه بخەمه ڕوو.

کل داوود (گۆڕی داوود) له گۆڕەکانی ئەمڕۆیی دەچێت. لەو گۆڕانه دەچێت که له دەور و پشتی پرسپۆلیس بەرچاو دەکەون. بەڵام کـەمتر هەڵـکەندن و ڕازاوەیـی پاشایانەی پێوه دیاره. له سەر ئەم گۆڕەدا وێنایەک و چوارگۆشەیەکی تیادایـه کـه پێشووتر له ناو ئەم چوارگۆشەیەدا نووسینی تیادا بووه. خوڕافات ئەم گۆڕەی وەک زیارەتگایەک لێکردووه و جاربەجار سەردانی دەکەن. بەڵام ئەم پیرۆزیه نـەیتوانیوه بەر له بەتاڵ کردن و شکاندنی ستوونەکان له لایەن موسڵمانەکانەوه بگرێت.

---

١ - شیاوه ئەمه له بەرچاو بگرین که وشەی باتیر که بۆ شوێنی سەرپێڵ له سەردەمه کۆنەکاندا به کار هاتووه وەرگێردراوەکەی له زمانەکانی توورانی مادیدا بەرچاو دەکەوێت. وشەی باتو له زمانی مادیدا به واتای «ژێرەوه و خواروو» دێت. بەڵێ ئێمه ئەوەش دەزانین که له کاتی هێرشی «پاشـا ئەنوبانی»دا ئەم شوێنه توورانیەکان و مادیەکانی لێ نیشتەجێ بوون. کەوابوو به کار هێنانی وشەی «چیای خواروو» که له لایەن دانیشتوانی دۆڵەکانی سەرووی زاگرۆسـەوه بـه کـار هاتبێـت زۆر سروشتیه. هەر چەنده که نووسینەکان به زمانی «سامی»ن، بەڵام ناوه جوگرافیه توورانیـەکانی بـه باشی تیایدا پارێزراوه.



شێوەی ٥٩- تاشەبەردی ئانۆبانی، سەرپێڵ.

لە سەر کەناری ڕاستی ڕووباری هەڵوان و بە دووری یەک ڕۆژ ڕێگا (بە پێ) شاری بچووکی قەسری‌شیرین[1] هەڵکەوتووە. ئەم شارە لە سەر شوێنی شارێکی

١- ژاک دمۆرگان: قەسری‌شیرین بازاڕێکی خراپ و ناڕێکوپێکی هەیە. کاراونسەرایەکی گەورە ویرانی هەیە و هەر وەها سەربازخانەیەکی بێ‌سەربازی تیادا دروست کراوە. لە قەسری‌شیرین کۆشکێک و چەند بورجەکێک هەیە کە دوازدە ساڵ لەمەو بەر لە لایەن سەرۆک جوان‌مێر

کۆن بنیاد نراوە. قەسری‌شیرین شارێکە کە گرنگی ئەوتۆی نیە و تەنیا گرنگیەک کە هەیەتی هی لە سەر ڕێگای تاران و بەغداد بوونی و چەند کاروانسەرایەکی خراپە کە هەیەتی. هەروەها چەند کەلاوەیەک لە قەسری‌شیرین هەیە کە سەرنج‌ڕاکێشن.

لە کتێبی «سەفەری بۆکینگهام»دا (لاپەڕە ٣٨ بە دواوە) باسی سەرنج‌ڕاکێش لە بارەی کەلاوەکانی قەسری‌شیریندا بەرچاو دەکەون. سیلڤێستێر دۆساسی لە نووسینەکانی لە بارەی سەردەمە مێژووییە جیاوازەکانی ئێران (ل ٢٣٥)دا باسیان لێوە دەکات و هەروەها ئۆلیڤێر لە سەفەردا (بەرگی ٥، ل ٣٢) تیشکی خستوونەتە سەر. ئەم کەلاوانە سەرنجی بینەر بۆ لای خۆی ڕاکێش دەکەن. یاقووت بەم شێوە باسیان لێوە دەکات: «ئەوەی کە لەم بینا و دامەزراوانە هێشتا ماوەتەوە بیر و سەرنج‌ڕاکێشە. ژوورەکان و هۆڵەکان و شوێنەکانی چوونە دەرەوە و حەوشێ و

---

سەرۆکی کوردەوە بنیاد نراون و ناوبراو لەگەڵ خێزانەکانیدا لەوێدا ژیان بە سەر دەبات. ناوبراو کاربەدەستی سەردانکەرانی کەربەلا بوو. بەڵام دواتر فەرمان بە حیسام‌الملک باوکی میرپێنج حیسام‌الملک حاکمی کرماشان درا کە کۆتایی بە دەسەڵاتی جوان‌مێر بهێنێت. حیسام‌الملک لە نزیک کۆشکدا خێوەت بەرز دەکاتەوە و لای سەرۆکی کورد خۆی وەک دۆستی نزیک پیشان دەدات. ناوبراو بەرەو ناو خێوەت دەعوەت دەکات و جوان‌مێر بەرەو خێوەت دەچێت. بەڵام بەر لە گەیشتنی بە خێوەتەکە ناوبراو دەگرن و سەری دەبڕن! کۆشک چەند ڕۆژێک خۆڕاگری کرد و خێزانەکانی جوان‌مێر بە سیلاح بەرگریان لە خۆیان دەکرد و ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی ئێرانیان کوشتن. بەڵام دواتر دوژمن بە گولە تۆپ هێرشی کرد و دیوارەکانی کۆشکی لە ناو برد. ١٨ ئەفسەری جوان‌مێر گیانیان لە دەست دا و ١٩ی‌تر گیران بۆ تاران نێردران و ئەوانیش لە ساڵی ١٨٨٨دا لە سێدارە دران. جوان‌مێر سوننی بوو و لە لایەن زل‌السولتانەوە ئەم پۆستەی پێدرابوو. ئەمڕۆکە دزی بە شێوەیەکی‌تر بە ئەنجام دەگات. واتا حاکم بە زۆر پارەی سەردانکەران و خەڵکان دەستێنێت و هەر کارێک بکات بۆی دەکرێت، چونکە پارێزگاری سنوورە! چونکە ئەم کەسە نەیتوانی پارە لە من بستێنێت زەحمەتی زۆری لە بەرپرسی حەمام کرد و پارەی زۆری لێستاند، بەم بەهانەوە کە ڕێگەی داوە سەگە مەسیحیەکان (کە مەبەستی ئێمە بوو) بڕۆنە ژوورەوە! بەڵام ئێمە هەرگیز بەرەو ئەوێ نەڕۆیشتبووین. چونکە پیسی ئەوان بۆ ئێمە بەس بوو تا بەرەو ئەم شوێنە نەچین و ئەوێ گڵاو نەکەین! (نووسینەکانی ١٨ی مارسی ١٨٩١ی ژاک دمۆرگان).

باخەکان و... هتد کە پاشماوەکانیان لە بەرچاوە سەلمێنەری مەزنی و گەورەیی ئەو کەسەیە کە ئەم شوێنانەی بنیاد ناوە.



شێوەی ٦٠-هەڵکەندراوایی کەل داوود.

سەردەمی دروستکردنی ئەم بینایانە کە ئەمڕۆکە تەنها کەلاوەکانیان ماوەتەوە بۆ سەردەمی ساسانی دەگەڕێتەوە. ئەم بینایانە بە پشتێنەیەکی دارچێنراو دەور دراون و لە دوو کۆشک و قەڵایەکی خۆڕاگر پێکهاتوون کە لە ناوەڕاستی شار هەڵکەوتوون.

ئۆردووگایەک کە ئەمڕۆ قەڵای پێدەگوترێت بە چەندین بورج دەوری گیرابوو

و لە ڕابردوودا چەندین بینای تریشی لە خۆ دەگرت کە ئەمڕۆ جگە لە بناغەکانیان و چەند کەلاوەیەک شتێکی تریان لێ نەماوەتەوە.

گوتمان کە چوار دەوری ئەم کۆشکە پشتێنەیەکی دارچێنراو و باخات بووە. بۆ گەیاندنی ئاو بە گشت باخەکە تۆڕی ئاودێری بۆ دابینکراو بووە.

بینا سەرەکیەکە کە بە قەسری شیرین ناسراوبوو لە شێوەی لاکێشەیەکە بووە و لە بەرامبەریدا عەمبارێکی گەورەی ئاو دانرابوو.

لە بەشی باشووری پشتێنە دارچێنراوەکەدا کۆشکێکی بچووکتر هەبووە کە ئەمڕۆکە بە کۆشکی چوار دەر (چوار قاپی) ناسراوە. ئەم کۆمەڵە کۆشک و قەڵایە دەبێت سیما و وێنایەکی جوان و ڕازاوەی هەبووبێت و تەنانەت ئەمڕۆش کەلاوەکان ئەم وێنایە لە مێشکی بینەردا دەخولقێنن.

بینایەکان لە بەرد و گەچ بنیاد نراون. هەڵکەندن و ڕازاندن و وردەکاریان تیادا بە کار نەهێناوە. بەردەکان نەتاشراون و تەنانەت ستوونەکانیش بە کەلوپەلی ورد دروست کراون. ئەمە پیشاندەری پەلە کردنێکە کە لە بنیادنانی بیناکاندا هەیانبووە. واتا ئەم باس و چیرۆکانە کە لە بارەی خوسرەودا دەبیسترێن پێدەچێت ڕاست بن و ئەمە لە پەلەکردنی بنیادنانی ئەم بینا مەزنانەدا بە مێشک دەگات.

گەر کەلاوەکانی قەسری شیرین لە لایەن هەر سەردانکەرێکەوە بینراون ئەوا کەمتر کەسێک کەلاوەکانی حەوش کوڕی (شوێنی ئەسپەکان)یان بینیوە. کوردانی ناوچەکە باس لەمە دەکەن کە ئەو شوێنانە تەنیا بۆ ڕاگرتنی ئەسپەکان بووە و ئەمە تەنیا تەویلە بوون، بەڵام ئەم وتەیە هیچ بنەمایەکی نییە. بیناکانی حەوش کوڕی دروست لە ئەوانی قەسری شیرین دەچن و پێدەچێت حەوش کوڕی شوێنی حاکم یا شوێنی حەوانەوەی یەکێک لە نزیکانی حاکم بووبێت. ئەم کەلاوانە لە نزیک دە

فەرسەنگی باکووری قەسری‌شیرین و لە نزیک سنووری عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) هەڵکەوتوون. ئەم ناوەندە چوار بەشە کە بریتین لە کۆشکی سەرەکی و دوو بەشی نیشتەجێ‌بوونی‌تری لە یەکتر جیا و باخەکان. باخەکان شوێنەکانی نیشتەجێ بوون لە کۆشکەکە جیا دەکەنەوە.

سەردانی ئەم ناوچەیە زۆر مەترسیدارە، چونکە لە نزیک هەزار مەتری سنووردا هەڵکەوتووە و زۆر جار گروپە کوردەکان بۆ هێرش‌کردنە سەر ئێران بۆ ئەم ناوچەیە دێن.

کەمێک بەرەو باکوور لە دۆڵێکدا تاشە بەردی هۆرێن شێخان بەرچاو دەکەوێت. من ئستامپاژ (وێنا- لە بەرگرتوو)یکم لێی هەڵگرتووە. لە سەر ئەم تاشەبەردە وێنەی پیاوێکی کەواندار هەڵکەندراوە کە پێی لە سەر جەستەی ئەسیرێکدا داناوە و ئەسیرەکە ڕواڵەتێکی پێشان داوە کە لە پاڕانەوە دەچێت. هەروەها لە پشتی سەری پیاوە کەواندارەکەدا کۆمەڵێک تیر کە لە پشتی بەستراون بەدی دەکرێن.

ئەم تاشەبەردە لە دوای بنیادنانی بیناکان دروست کراوە. لە سەر ئەم تاشەبەردەدا نووسراوە: تار..... دۆنی والی(؟) کوڕی «سین‌ئیپ‌شا». ئەم پەیکەرە دووبارە لە شوێنی خۆی دانراوە کە دوای بەربوونەوەی چاک کراوەتەوە و لە شوێنی خۆی دانراوەتەوە. هەر کەسێک ئەم پەیکەر (تاشەبەرد)ە خرا بکات شاماش و ئەدەد ناو و ڕەگەزەکەشی لە ناو دەبەن.

لە بارەی مێژووی تاشەبەزدێکی وەهادا کە تەنیا مێژووی چاک‌کردنەوەکەی بە سەردەمی گودێنا دەگات دەبێت چی بڵێین؟

من بە وردی سەردانی کوێستانەکانی زەهاوم کردووە و پێم وا نییە ئاسەوارێکی

مێژوویی تری لێبێت کە بە دەرەوە بێت و بێ هەڵکەندن بتوانین ببینین. بەڵام مـن وا دەزانم پشکنینی زانستی ناو خاکیش لەم ناوچەیەدا دۆزینەوەی گرنگ بە دەسـتەوە دەدات.

یەکێک لە شوێنەکانی ناوچەی زەهاو کە بـە ڕاسـتی شـیاوی بینینـە، گونـدی ڕەجەوە. ئەم گوندە لە ناو تەشەرد و کەفرەکاندا بزر بـووە . لـە ڕاسـتیدا گوندێـکی نادیارە و ڕێگاکانی پێوەندی ئەم گوندە بە دەرەوە ڕێچکە و کوێرە ڕێگاکانی نێـوان کەفرەکانن کە ڕێگەی زۆر تەنگەبەر و باریکن و ٥ مەتر پانتایی ڕێگە فراوانەکانـە کە بەم گوندە دەگەن. ئەم گوندە شێوە و شێوازی کۆنی خۆی بە باشی پاراسـتووە و لە داوێنی بەرزایی و لە ناو تاشە بەردەکاندا هەڵکەوتووە. چوونە ناو ئەم گوندە (لـە کاتی شـەڕ و تێکهەڵـچووندا) نامومکینـە و گونـدی ڕەجـەو زیـاتر لـە هێـلانەی هەڵۆیەک دەچێت کە لە نـاو کوێسـتانەکاندا هەڵـکەوتووە و بـە سـاکاری وڵامـی هێرشەکان دەداتەوە.



شێوەی٦١-سیمای گوندی ڕەجەو.



شێوەی ٦٢- سەرستوونەکانی ساسانی دۆزراوە لە تاق وەسان



شێوەی ٦٣- سەرستوونەکانی ساسانی دۆزراوە لە تاق وەسان.

ئێمە لە باسەکانماندا تا ڕادەیەک تیشکمان خستۆتە سەر شوێنە

سەرنج ڕاکێشەکانی بەشی باکووری کوردستانی کرماشان، بەڵام هێشتا ئەم باسەمان بە باس کردنی شوێنەکانی دۆڵی ڕووباری گاماسیاو لە ناوەڕاستی لوڕستان و ناوچەکانی پشتکۆ دەوڵەمەند نەکردووە. لە هەلێران چەندین کەلاوە بوونی هەیە کە مێژووەکانیان بۆ سەردەمە زۆر کۆنەکان دەگەڕێتەوە. لەگەڵیشیاندا چەند کەلاوەیەک هی سەردەمی ساسانین. لە ناو ئەم کەلاوانەدا من باس لە قەڵای سام (قلاسم) و پردی زیش ی گاماسیاو لە باڵەوەن دەکەم. لە شوێنێکدا کە بە زیش ناسراوە کەلاوەی سەردەمی ساسانی بەرچاو دەکەون، بەڵام گەیشتن بەم کەلاوانە و سەردان کردنیان زۆر مەترسیدارە، چونکە دانیشتوان و خەڵکانی ئەم ناوچەیە زۆر مەترسیدارن.

**کشتوکاڵ، بازرگانی و پیشەسازی**

لە ناوچە بەرزەکاندا بەرهەمەکانی کە کشتوکاڵیان پێوە دەکرێت هەر ئەوانەن کە لە ناوچەکانی تری ئێران بەرچاو دەکەون و دانیشتوانی ئەم ناوچانە خەریک بە چاندنی گەنم و جۆ و سەوزە و خەشخاشن. کشتوکاڵ لە دەشتەکانی کرماشان و مایدەشت زۆر باشتر و لە ناوچەکانی وەک دینەوەر و هەلێران و ئەیوان کشتوکاڵێکی لاوازە. بەڵام لە بارەی زەهاوەوە دەبێت بڵێین کە لەم ناوچەیەدا جگە لە کشتوکاڵێکی باش و سوودمەند شتێکی تر بەرچاو ناکەوێت.

لە بارەی پیشەسازیەوە دەبێت ئەمە بخەمە ڕوو کە لەم ناوچانەدا پیشەسازی زۆر کەم پێشکەوتوویە و جگە لە دروستکردنی ڕاخەر و قوماشە ئەستوورەکان کە ئافرەتانی شار و گوندەکان پێیەوە خەریکن و پیشەی دروست کردنی قفڵ کە خەڵکانی کرند (کرێن) تیایدا شارەزان شتێکی تری جێگەی باس بەرچاو ناکەوێت.

بەڵام لە کرند (کرێن) بۆ دروستکردنی قفڵ شتی سەرنجڕاکێش دەبینرێت. ئەوان بە شتومەکێکی زۆر سادە و ساکار ئامێری زۆر ئاڵۆز دروست دەکەن. من لە ناو قفڵەکانیاندا قفڵی ڕەمزدار (کە ڕەقەمی سرییان هەبوو) بەرچاوم کەوت کە بە ڕاستی سەرنجی ڕاکێشام. داهاتی سەرەکی ئەم ناوچانە لە هاتوچۆی کاروانەکانەوە دەست دانیشتووانی ناوچەکە دەکەوێت. گشت شتومەک و کەلوپەلێک کە لە ئێران بەرەو بەغدا یا بە پێچەوانەوە بێن لە کرماشان تێپەڕ دەبن. هەروەها گشت ئەو کەسانە کە لە ڕۆژهەڵاتەوە سەردانی کەربەلا دەکەن لە دەروازەکانی زاگرۆس تێپەڕ دەبن و بە تێپەڕبوونیان لەم ناوچانە داهاتی ئەم خەڵکانە دابین دەبێت.[1]

ژمارەیەکی زۆر تەرح و پێشنیار دراون کە بانی ئێرانی بە هۆی ڕێگەیەکی سەردەمیانە یاخود هێڵی شەمەندەفەر بە کەنداوی فارس بگەیەنێت. لە تەرح و پێشنیارەکاندا باس لەوە کراوە کە ڕێگەکە بە بەندری بووشێهر یا شەرار یا دزفول یا شووش یا قومدا تێپەڕ بێت، بەڵام لە ڕاستیدا بەربەستە سروشتیەکان بە ڕادەیەک زۆر و قورسن کە هیچ یەک لەم پێشنیارانە تا ئێستا قەبووڵ نەکراون.

بە ڕای من باشترین ڕێگەی بە یەکەوە بەستنی تاران و بەغداد هێڵی

---

١- هەناردەکردن و هاوردەکردن لە ڕێگەی کرماشان و خانەقین و بەغدادەوە لە ساڵی ١٨٨٩دا بە پێی نووسینەکانی ڕۆژنامەی ژووری بازرگانی قوستەنتەنیەی ژمارە١٧ی مەی ١٨٩٠ بەم شێوەیە بووە:

| هاوردەکردن | هەناردە کردن |
|---|---|
| ڕاخەر | ٤٠٠٠ لیرەی تورکی |
| مەڕ وماڵات | ٣٠٠٠٠ لیرەی تورکی |
| خوری | ٢٠٠٠ لیرەی تورکی |
| کەرە | ٣٠٠٠٠ لیرەی تورکی |
| دانەوێڵە، مازوو، کشمیش، توتن و...هتد | ٣٧٧٠٠٠ لیرەی تورکی |
| کەلوپەلەکانیتر | ٧٠٠٠ لیرەی تورکی |

شەمەندەفەرە. تەنیا شوێنێک کە بۆ ئەم پرۆژەیە سەختی تیادا دەبێت ناوچەکانی زاگرۆسە. بەڵام لە زاگرۆسیش بە بنیادنانی چەند پرد و لێدانی چەند تونێلێک و دەوردانەوەیەکی بەرزاییەکانی ڕەجەو کێشەکە بەرەو نەمان دەچێت. لە نێوان بەغداد و سەرپێولدا زەویەکان بە تەواوی ناسۆیین و لە نێوان زاگرۆس و تارانیشدا بەربەستێکی وەها بوونی نییە. واتا تەنیا گرفتێک لێرەدا ئەوەیە کە گشت ئەم هێڵە لە ناو خاکی ئێراندا نابێن و بەشێکی بە ناو خاکی عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) دەگات. بەڵام ئەم کێشەیە گرنگی ئەوتۆی نییە چونکە پێوەندیەکانی نێوان ئێران و عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) زۆر باشە. تەنانەت ئەمە بۆ ئێران باشتریشە کە کۆتایی هێڵەکە بە جۆرێک نەبێت کە ئەورووپیەکان تەماعێک لایان دروست ببێت. ئەمە لە لایەکی تریشەوە لایەنی باشی هەیە کە لە ناو ئێراندا ناوچە نەوتیەکانی کۆشکیشیرین هەن کە بۆ سووتەمەنی مەکینەکان پێویستە. بەڵێ نرخی سووتەمەنی لە ئێرانیشدا دەزانین.



شێوەی ٦٤- سەرستوونەكانی ساسانی دۆزراوە لە تاق وەسان.

بەغداد بۆ بوون بە بەندەر گرفتی زۆری هەیە بۆیە گەیشتنی هێڵەکە بە کەنداو و بەسرە یا فاتۆ باشترە.

لە ڕوانگەی ئابووریەوە وەها هێڵێک خزمەتێکی نەبڕاوە بە ئێران دەکات. بازاڕەکانی ئەمڕۆی ئێران گەرمی زۆریان تیادا بەدی ناکرێت، بەڵام بە گەیشتنی بەروبوومەکانی وەک دانەوێڵە و خوری و لۆکە و میوەکان و... هتد و ئاڵوگۆڕ پێکردنیان بازاڕ گەرمی بە خۆیەوە دەبینێت.



شێوەی ٦٥-سەرستوونەکانی ساسانی دۆزراوە لە تاق وەسان.



شێوەی ٦٦- سەرستوونەکانی ساسانی دۆزراوە لە تاق وەسان.



شێوەی٦٧- سەرستوونەکانی ساسانی دۆزراوە لە تاق وەسان.

لە ڕوانگەی سەربازیشەوە ئەم هێڵە خزمەتی کەم بە ئێران ناگەیەنێت. لە کاتی بوونی ئەم هێڵەدا هێزەکانی ئێرانی بە کۆ لە کاتێکی زۆر کەمدا دەتوانن دووریـەکی زۆر ببڕن و بە ناو سنوورەکانی عوسمانی (عێراقی ئەمڕۆ) بگەن و لەم لایەنەشـەوە ئێران پێشکەوتنی باش بە خۆیـەوە دەبینێـت. لـە ئاراراتـەوە تـا کەنـداوی فـارس ناوچەی کرماشان تەنیا شوێنێکە کە لە زۆر لایەنەوە گرنگـی بـۆ خـۆی تـەرخان کردووە.

# Kurdistan
## in the J. De Morgan Studies









**By:**

J. De Morgan

**Translated By :**


**Dr. Saeed Khezri**
**(university of Kurdistan)**

**Aso Abdulrahman**


Graphics: S. Khezri



له بلاوکراوەکانی خانەی چاپ و بەخشی ڕێنما

نرخ (٣٠٠٠) دینار